بسم الله الرحمن الرحيم

# حَمْدِێ خُدِێ

حَمْدِێ بِێ حَدْ بُۆ خُدَایِێ عَالَمِینْ
اَوْ خُدَایِێ دَایَه مَه دِینِێ مُبِینْ

اَمْ کِرِینَه اُمَّتَا (خَیْرُ الْبَشَرْ)
تَابِعِێ وِی مُقْتَدَائِێ نَامِوَرْ

اَوْ خُدَائِێ مَالِكُ الْمُلْكِێ عَظِیمْ
دَایَه مَه مِیرَاثَا قُرْآنَا کَرِیمْ

دِینِێ مَه کِرْ کَامِلُ و نِعْمَتْ تَمَامْ
یَعْنِی دَا مَه اَحْمَدُ و (دَارُ السَّلَامْ)

اَوْ خُـدَایـێ بـێ نَظِیرُ و (ذُو الْـجَـلَالْ)
بـێ مِـثَـالُ و بِـێ هَـڤَـالُ و بـێ زَوَالْ

رَازِقـێ بـێ دَسْـتُ و پَـا ؤُ مَـارُ و مُـورْ
عَـالِـمـێ سِـرَّا نَـگُـوْتِـێ دَرْ صُـدُورْ

کَـارِسَـازێ بَـنْـدَه ؤُ سُـلْـطَـانـێ جَـانْ
رَاحِـمُ و رَحْـمَـانْ لَطِـیفُ و مِـێـهْـرَبَـانْ

آسِـمَـانـێ بـێ سِـتُـونْ وِی کِـرْ بَـدِیـدْ
صـوُرَتـێ بَـاخَـالُ و خَـطْ، وِی آفَـرِیـدْ

هِـێـڤِـیـدَارِیـنْ اَمْ ژِ تَـه شَـاهِـێ کَـرِیـمْ
(اِهْـدِنَـا یَـا رَبْ صِـرَاطَ الْـمُـسْـتَـقِـیمْ)

نـێ ژِ مَـه سُـوجُ و خَـطَـا تِـێـنُ و سِـتَـمْ
لـێ ژِ تَـه اِحْـسَـانُ و غُـفْـرَانُ و کَـرَمْ

یَـا رَبْ اِیـمَـانـێ دِخْـوازِیـنْ اَمْ مُـدَامْ
ژِێـرِێ آلَایَـا مُـحَـمَّـدْ (وَالـسَّـلَامْ)!

گَـرْ دِقِـيْـتِـنْ هُـونْ ژِ نَـارِی بِـنْ نَـجَـاةْ
بِعَشْقُ و شَـوْقَـكْ هُـونْ بِـبِـيْـژِنْ: اَلـصَّـلَاةْ!

## پَسْنِیْ پَیْغَمْبَرْ ﷺ

بَـر تُـو بَـادَا هَـرْ زَمَـانُ و آنُ و حِینْ
اَیْ مُـحَـمَّـدْ صَـدْ هَـزَارَانْ آفَـرِیـنْ

اَیْ شَـفـیـعُ و دَارُوِیْ هَـرْ عِـلَّـتِـیْ
دِیـدَه وُ بِـیـنَـاهِـیَـا ڤِـیْ اُمَّـتِـیْ

دَسْـتَـگِـیـرُ و مُـسْـتَـغَـاثِـیْ هَـرْدُو كَـوْنْ
بُـوْ گُـنَـهْـكَـارَانْ پَـنَـاهُ و پِـشْـتُ و عَـوْنْ

(صَـلِّـى يَـا رَبِّ عَـلٰـى خَـيْـرِ الْـبَـشَـرْ)
تَـا هَـبِـنْ طَـيْـرُ و بِـخُـونِـنْ بَـر شَـجَـرْ

اَوْ حَـبِـيـبِـیْ رُوْهْـنِـيَـا حَـفْـتْ آسِـمَـانْ
هَـرْدُو عَـالَـمْ قَـالِـبْ، اَوْ رُوحُ و رَوَانْ

خَاكپَايِیٚ اَحْمَدْ اَوْ (بَیْتُ الْحَرَامْ)
لَوْ شَرِیفِنْ زَمْزَمْ و رُکْنُ و مَقَامْ

(صَلِّ یَا رَبِّ عَلَی خَیْرِ الْوَرَی
مَا تَسِیرُ الشَّمْسُ فِی سَبْعِ الْعُلَی)

فَخْرِیٚ اِبْرَاهِیمُ و اِسْمَاعِیلُ و نُوحْ
مُصْطَفیٰیِیٚ بَاوَفَایِیٚ بَافُتُوحْ

(مَا رَمَیْتَ اِذْ رَمَیْتَ) گُوٚشِدَارْ
دَسْتِیٚ وِی دَسْتِیٚ خُودَا، دَرْ کَارُ و بَارْ

(صَلِّ یَا رَبِّ عَلَی خَتْمِ الرُّسُلْ
مَا یَمُوجُ الْعَاشِقُونَ فِی السُّبُلْ)

اَوْ کَلِیمِیٚ خوش نَوَائِیٚ چَرْخِیٚ طُورْ
دَاغِدَارِمْ بُوٚ وِی سِیمَائِیٚ بِنُورْ

اَوْ شَفِیعُ و صَاحِبِیٚ آلَایِیٚ حَمْدْ
مِنْ هَنَه بِیٚ حَدْ گُنَهْ نِسْیَانُ و عَمْدْ

لِىٚ مَه هِيٚڤِى وَاثِقَه دِىٚ اَزْ فَقِيرْ
ژِيٚرِىٚ آلاَيَا تَه بِمْ رُوٚژَا عَسِيرْ

## خِيٚرَا خوندِنَا مَوْلُودِىٚ

هَرْ كَسِىٚ گُوهْدَارِىٚ مَوْلُودَا نَبِى
دَرْگَهِىٚ مِزْگِينِيَانْ دِىٚ لِىٚ ڤَبِى

گُوٚتِ وِى پَيْغَمْبَرِىٚ عَالِىصِفَتْ:
"مَوْلُودَا مِنْ هَرْ كَسِىٚ مَازِنْ بِكَتْ

اَزْ شَفِيعِىٚ وِى مَه رُوٚژَا مَحْشَرِىٚ
دِىٚ ڤَخُوتْ اَوْ تَازَهآڤَا كَوْثَرِىٚ

صَرْفِىٚ مَوْلُودَا مَه يَكْ دِرْهَمْ فَرَه
هَمْبَرِىٚ يَكْ كُوٚهِىٚ زِيٚرِىٚ اَحْمَرَه"

(فِى سَبِيلِ اللّٰهْ) بِبَخْشِينْ بَرْ فَقِيرْ
قَدْرِىٚ مَوْلُودِىٚ بِزَانِنْ هُونْ كَبِيرْ

هَمْ ژِ بُوبَكرُ و عُمَرْ هَاتْ اَڤْ خَبَرْ
هَمْ ژِ عُثْمَانُ و عَلِى چِێبُو اَثَرْ:

"دِرْهَمَكْ بِتْ صَرْفِێ مَوْلُودَا نَبِى
خَيْرَكَه مَازِنْ ژِ بۆ حَاصِلْ دِبِى"

هَمْ ژِ شَيْخَانْ بُو رِوَايَتْ اَڤْ خَبَرْ
شَيْخِێ كَرْخِى، فَخْرِێ رَازِى، بَا دِگَرْ:

هَرْكَسِێ حَاضِرْ بِكَتْ اَوْ يَكْ طَعَامْ
بَا بُخُورُ و شَرْبَتُ و قَدْرِێ تَمَامْ

گَازِى كَتْ اِخْوَانُ و هِلْبِيتِنْ چِرَا
بِێتَه خُونْدِنْ مَوْلُودَا (خَيْرُ الْوَرٰى)

تِێتَه حَشْرِێ اَوْ دِگَلْ خَلْقِێ بَرِى
يَعْنِى بَا پَيْغَمْبَرَانِێ اَنْوَرِى

هَرْچِى بِينِتْ هِنْدِى تِشْتِێ خَوارِنِێ
دِێ مُبَارَكْ بِتْ لِبَرْ وِێ خُونْدِنِێ

بِێتَە خَونْدِنْ گَرْ لاڤِێ اِێ ڤَخُوتْ
رَحْمِێ نَازِلْ جُمْلَەیِێ عِلَّتْ دِبِتْ

بِێتَە خَونْدِنْ گَرْ لِیَكْ سِكَّەدِرَاڤْ
دِێ مُبَارَكْ بِنْ دَرَاهِمْ بِبْنَە زَاڤْ

هَرْ جِهِێ لِێ بِێتَە خَونْدِنْ رَحْمَە لِێ
دِێ مَلَكْ بِێنُ و تِژِی وِێ مَنْزَلِێ

خَانِیِێ لِێ بِێتَە خَونْدِنْ اَڤْ صَلَاَ
دِێ بِبِیتَە بَاعِثِێ دَفْعَا بَلَاَ

بُۆ خَودَانِێ زَادِیُ و بُۆ هَمْنِشِینْ
هَرْ صَلَاتَانْ دِێ بِدَنْ كَرُّوبِیِینْ

دَافِعِێ جُمْلَە حَسُودِێ چَاڤْخَرَابْ
دَرْ مَزَارِی سَهْلَە لِێ رَدَّا جَوَابْ

پِڕْ كَسَانْ دِیتِنْ كَرَامَاتُ و آثَرْ
ژْ خَونْدِنَا مَوْلُودَا سُلْطَانِێ بَشَرْ

هَـرْ وَكِـى هَـاتِـينَـه گُـوْتِـنْ بِـىْ حِسَـابْ
لِـىْ نَـشِـيْمْ بِـيْـژِمْ ژِ تَـطْـوِيـلاَ كِـتَـابْ

قَـدْرِىْ مَـوْلُـودِىْ نِـزَانِـمْ بِـيْـژِمْ اَزْ
لِـيْكْ هِـشْـيَـارْ بِـنْ دَا نَبِيتَه جَـرْگَـهبَـزْ

گَـرْ دِقِـيْـتِـنْ هُـونْ ژِ نَـارِى بِـنْ نَـجَـاتْ
بِعَـشْـقُ و شَـوْقَـكْ هُـونْ بِبِـيْـژِنْ اَلـصَّـلاَتْ

## آفِـرَانْـدِنَـا نُـورَا مُـحَـمَّـدْ ﷺ

گِـرْتِ يَـكْ قَـبْـدَه ژِ نُـورَا خَـوه خُـدَا
گُـوْتَـه وِىْ (كُـنِـى حَـبِـيبِـى اَحْـمَـدَا!)

هِيْژْ نَـه عَـرْشُ و فَـرْشُ و كُـرْسِـىُ و قَلَمْ
هِـيْـژْ نَـه لَـوْحُ و اَنْـبِـيَـايِـىْ مُـحْـتَـشَـمْ

سِـالَـهَـا تَـسْـبِـيحِ كِـرْ نُـورَا شِـگَـرْفْ
شَـشْ مِـاَتْ اَلْـفُ و چِـهَـارُ و بِيسْتِ اَلْـفْ

پَاشِیٚ بُوٚ وِیٚ چِیٚکِرِنْ دِوَازْدَه حِجَابْ
هَـرْ یَکِیٚ خَوشْتِرْ ژِ یَا دِی دَرْ حِسَابْ:

قُـدْرَتْ و تَعْظِیمْ و مِنَّتْ مَرْحَمَتْ
هَـمْ سَعَادَتْ هَـمْ کَـرَامَـتْ مَنْزِلَتْ

هَـمْ هِـدَایَـتْ هَـمْ نُـبُـوَّتْ رِفْـعَتَـه
طَـاعَـتَـه یَـازْدَه، شَـفَـاعَـتْ تَـمَّـتَـه

هَـرْ یَـکِـیٚ وَسْتَـابُـو تِـیٚدَا چَـنْـدِ سَـالْ
لِـیٚ عَـدَدْ مَـه سْپَـارَه عِـلْـمِـیٚ لاَ یَـزَالْ

هَـرْ یَـکِـیٚ تَـسْبِـیحَـکَـه خَـاصْ و جُـدَا
دَائِـیـمَـا تَـسْبِـیحِ خَـونْـدِنْ بُـوٚ خُـدَا

پَـاشِـیٚ آقِـیٚتَـه چِـهَـارْ بَـحـرِیٚ مَـزِنْ
وِی خُـدَایِـیٚ لاَیَـزَالِـیٚ اِنْـسْ و جِـنْ:

بَـحْـرِیٚ نُـصْـرَتْ ثَـانِـی بَـحْـرِیٚ مَرْحَمَتْ
بَحْرِیٚ قُـدْرَتْ بَحْرِیٚ عِـرْفَـانْ (اِیـنْ هَمَه)

چُـوْنْ ژِ بَـحْـرَا مَـعْـرِفَـتْ اَوْ هَـاتَـه دَرْ
قَـطْـرَه ژێ وَرْيَـــانْ بِـإِلْـهَـامْ اَڤْ قَـــدَرْ:

سَـــدْ هَــزَارُ و هَــمْ چِـهَـارُ و بِيسْتِ اَلْـفْ
هَــرْ يَـكِـێ بُـــو يَـــكْ نَـبِـيِّـێ دِلْشِـــكَـــرْفْ

پَـــاشِـــێ وِی چِـێـكِـرْ ژِ نُـــورَا نَـــامِـــوَرْ
جَـــوْهَـــرَكْ لِـــێ كِـــرْ نَـــظَـرْ اَوْ بُـــو دُو كَـرْ

نِـصْـفِـێ اَوَّلْ دَايِـــێ چَـــاڤِـــێ هَـيْـبَـتِـێ
نِـصْـفِـێ ثَـــانِـــی دَايِـــێ چَـــاڤِـــێ شَـفْـقَـتِـێ

نِـصْـفِـێ اَوَّلْ بُـــويَـــه بَـــحْـــرُ و هَـــرْ لِـڤِـی
نِـــێ ژِ تِـــــرْسُ و هَـــيْـبَـتِـێ قَـــطْ نَـانِـڤِـی

هَـمْ كَـلِـی اَوْ بَـحْـرُ و كَـــفْ دَا وُ دُخَـــانْ
كَـفْ بُـــو اَرْضُ و هَـــمْ دُخَـــانْ بُـــو آسِـمَـانْ

نِـيـڤِـكَـا دِی چِـێـكِـرِنْ ژێ چَـــارِ چِـيـزْ
عَـــرْشُ و كُـــرْسِـــیُّ و قَـــلَـمْ، لَـوْحِـێ تَـمِـيـزْ

هَــاتِ اَمْــرِیٚ پَـادِشَـاهِــیٚ لاَیَــزَالْ
مَـالِـكُ الْـمُـلْـكِـیٚ جَلِیلِیٚ ذُو الْـجَـلاَلْ:

"یَـا قَـلَـمْ بِنْـقِـیسَـه اَمْـرِیٚ پَـادِشَـاهْ
اَزْ چِـه بِنْـقِـیسِمْ بِـفَـرْمَـانْ یَـا اِلَـهْ؟

(قَـــالَ: "اُكْـتُـبْ لاَاِلٰــهْ اِلاَّ اَنَــا)
هَــمْ مُـحَـمَّـدْ قَـاصِـدِیٚ اَمْـــرِیٚ مِـنَـه"

سَـاجِـدُ و بِـیٚ هَـشْ گَـرِی سَـدْ سَـالِـیٚ دِی
سَــرْ هِـلِـینَـا گُـوْتْ: "(اِلٰـهِـی، سَـیِّـدِی)

اَزْ دِزَانِــــمْ (لاَ اِلٰــهْ اِلاَّ) تُـوِی
اَوْ مُـحَـمَّـدْ هَـمْـبَـرِیٚ اِسْـمَـتْ بُـوِی

كِـیژْكَـه؟ یَـا سُلْطَانِیٚ بَـا جُـودُ و كَـرَمْ!"
پَـادِشَـاهِـیٚ سَـرمَـدِیٚ گُـوْتْ: "یَـا قَلَم

گَـرْ نَـبُـوِیَـا اَوْ مُـحَـمَّـد، لَــوْحُ و عَـرْشْ
مِـنْ نَـتِـیـنَـانَـه وُجُــودِیٚ تَـا بِـفَـرْشْ

نِیْ تُو وُ نِیْ جَنَّتْ و نَارِیْ مَزِنْ
جُمْلَه آشْيَا مِنْ ژِ بُوْ وِی چێكِرِنْ"

مُخْبَتِیْ هِنْگَافْتْ و شَق بُو اَوْ قَلَمْ
مَا لِسَرْ لَوْحِیْ اَیِيسِی دَمْ بَدَمْ

سَرْخَوشْ و سَكْرَانِیْ وِی نَاقِیْ شِرِینْ
پَاشِیْ بَا اِلْهَامَا (رَبُّ الْعَالَمِينْ)

گُوْتِ اَوَّلْ: "يَا مُحَمَّدْ اَلسَّلاَمْ"
هَمْ (عَلَيْكَ) گُوْتِ رَبِّیْ (لاَ يَنَامْ)

دَا (جَوَابَا عَنْ حَبِيبِ الْعِزَّتِی):
"(وَعَلَيْكَ اَلسَّلاَمُ رَحْمَتِی)"

بُويَه سُنَّتْ لَوْ سَلاَمْ و رَدِّیْ فَرْضْ
جُمْلَه‌یِیْ اَحْوَالِیْ پَاشِی كِرْنَه عَرْضْ

وِیْ نِفِيسِی پێكْفَه اُمَّتْ: قَنْجِكَارْ
جَنَّتِیْ و عَاصِيَانْ دِیْ بِچْنَه نَارْ

أُمَّـتَـا أَحْـمَـدْ نِـڤِيسِـى أَهْـلِـىٚ نُـورْ
(أُمَّــــةٌ مُــذْنِـبَــةٌ، رَبٌّ غَــفُــورْ)

جُـمـلَـهِئِـىٚ أَحْـوَالِـىٚ عَـالَـمْ پِـيشْ و كَـمْ
وِىٚ نِـڤِيسِـى بُـۆرِىٚ و هِـشْـكْ بُـو قَـلَـمْ

گَـرْ دِڤِـيْـتِـنْ هُـونْ ژِ نَـارِى بِـنْ نَـجَـاتْ
بِعَـشْقُ و شَـوْقَـكْ هُـونْ بِـبِـيْـژِنْ اَلـصَّـلَاتْ

## آفِرَانْدِنَا آدَمْ عليه السلام

چُـۆنْ اِيــرَادَتْ هَـاتِ سُـلْـطَـانِـىٚ رَفِـيعْ
چِـيْـكِـتِـنْ آدَمْ بِـڤِـى شَـكْـلِـىٚ بَـدِيـعْ

أَمْـــرِ هَـاتَـه گُـۆشِـىٚ جِـبْـرِيـلِـىٚ أَمِـيـنْ:
"قَـبْـضَـهِئِـىٚ بِـينَـه ژِ بَـيْـضَـائِـىٚ زَمِـيـنْ

أَوْ دِلِـىٚ أَرْضِــىٚ وُ هَـمْ حُـسْـنُ و بَهَا
زِيـنَـتَـا مَـكْـنُـونُ و دُرَّا بِــىٚ بَـهَـا

هَـاتِ جَـبْـرَائِـيـلْ و بَـااَمْـرِیٚ لَـطِـيـفْ
چَـنْـگَـكِیٚ آخِـیٚ ژِ وِیٚ قَـبْـرَا شَـرِيـفْ

گِـرْتْ و بَـا تَسْنِيمِیٚ صَـافِـی كِـرْ هَقِيرْ
تِـیْـكْـڤَـدَا حَـتَّـا كُـو اَوْ قَـنْـجْ بُـو خَمِيرْ

بُـو وَكِـی دُرَا سِـپِـی وِیٚ سَـاعَـتِـیٚ
غَـوْطَـه دَا دَرْ جُـويـبَـارِیٚ جَـنَّـتِـیٚ

اَمْـرِیٚ جَـبْـرَائِـيـلِ كِـرْ پَـاشِـیٚ چُـنَـانْ
"وِیٚ بِـگِـیْـرَه دَرْ زَمِـيـنُ و آسِـمَـانْ"

بَـرُّ و بَـحْـرُ و شَـرْقُ و غَـرْبِـیٚ عَـالَـمِیٚ
هَـاتـه گِـیْـرَانْ، هِـیْـژْ نَـه بَـحْـثَـا آدَمِـیٚ

نِـیٚ هَـزَارَانْ سَـالِ چُـونَـه آخَـرِی
اَوْ نَـبِـی بُـو آدَمْ هِـیْـژْ آقُ و هَـرِی

پَـاشِـیٚ هِـنْـگِـی خَـالِـقِـیٚ هَـرْ صُـورَتِـیٚ
چِـیْـكِـرِی آدَمْ بِـدَسْـتِـیٚ قُـدرَتِـیٚ

پُفْ کِرِیٚ رُوحَا خَوه اَوْ بُو نَازَنِینْ
لَوْ مَلَكْ هَاتِنْ ژِ بُوٚ وِی سَاجِدِینْ

بُو خَزِینَه اَوْ ژِ بُوٚ دُرَّا یَتِیمْ
دَانِیَه پِشْتَا وِی اَوْ نُورَا عَظِیمْ

پَاشِیٚ بِرْ آقِیٚتَه بَاغِیٚ جَنَّتِیٚ
غَیْرِی دَارِیٚ ژِیٚ بِخَوه هَرْ نِعْمَتِیٚ

صَفْ بِصَفْ وَسْتَانَه پِشْتَا وِی گَلَكْ
نَاظِرِیٚ نُورَا مُحَمَّدْ اَوْ مَلَكْ

گُوٚتِ آدَمْ: "اَقْ مَلَائِكْ بُوٚ چِه هَرْ
وِیٚ لِپِشْتَا مِنْ دِکَنْ دَائِمْ نَظَرْ؟"

رَبِّیٚ عَالَمْ گُوٚتَه آدَمْ: "اَیْ مُلِی!
تُو ژِ بُوٚ نُورَا مُحَمَّدْ حَامِلِی

اَوْ حَبِیبِیٚ مِنْ دِ پِشْتَا تَه ظُهُورْ
لَوْ مَلَكْ تِیٚنَه تَمَاشَایِیٚ ژِ دُورْ"

گُــوْتِ آدَمْ: "اَیْ خُـــدَاوَنْــدِیْ فَـلَـكْ
مِــنْ دِقِـیْـتِـنْ بِبِیْنَه پِـیْـشْ مِـنْ اَوْ مَـلَـكْ"

هَــمْ بِـفَـرْمَـانَـا خُـدِیْ وِیْ سَـاعَـتِـیْ
نُــورْ ژِ پِـشْـتِـیْ هَـاتَـه نِـیْـڤَـا جَبْـهَـتِـیْ

هِــنْ دِبِـیْــژِنْ: "هَـاتَــه تِـلْـیَـا شَـاهِـدِیْ"
لِــیْ حَـقِـیـقَـتْ هَــرْ دِزَانِــیـتِــنْ خُـدِیْ

مِـثْـلِـیْ رُوْژَا هَــاتِـیَـه اَوْجَـــا فَـلَـكْ
هَــمْ تَــحَـیُّــرْ آدَمُ و هِــنْــدِی مَـلَـكْ

گُــوْتِ آدَمْ: "یَـــا رَبْ اَوْ نُـــورَا قَـبُـولْ
مَایَه تِشْتَكْ؟" گُوْتِـیْ: "اَصْـحَـابِـیْ رَسُـولْ"

گُــوْتِ آدَمْ: یَـــا اِلَــهِــی قَـنْـجَـه بِـیْـتْ
بِبِیْتَه تِـلْـیَـانْ هَـرْچِـی مَـایِـی مِـنْ دِڤِـیْـتْ

نُــورَا بُـوبَـكْـرِی دِ وُسْـطَـا وُ عُـمَـرْ
بِـنْـصَـرُ و عُـثْـمَـانْ دِ خِـنْـصَـرْ مُـسْـتَـقَـرْ

هَاتَه اِبْهَامِیٚ دِبیٚنْ نُورَا عَلِی
شُغْلَه دَا تِلْیَانُ و جَنَّتْ مُنْجَلِی

هَاتِ حَوَّاءُ و نَظَرْ دَا نُورِیٚ صَافْ
گُوٚتِ: "یَا آدَمْ چِه نُورَه هُوٚ شَفَافْ؟"

گُوٚتِیٚ: نُورَا یَكْ نَبِیِّیٚ مَازِنَه
سَیِّدُ و هَمْ مَازِنِیٚ نَسْلَا مِنَه

چُوٚنْكِی بِیٚ اَمْرِی ژِ آدَمْ بُو ظِهَارْ
نُورْ ژِ اَنْیِیٚ هَاتَه پِشْتِیٚ بُو سِتَارْ

نِیٚ ژِ دَارِیٚ خْوارِنْ هَرْدُوكَانْ شِرِینْ
حُلَّهئِیٚ جَنَّتْ ژِ بَژْنِیٚدَا فِرِینْ

(اِهْبِطُوا مِنْهَا جَمِیعًا) هَاتِ اَمْرْ
آدَمَا دِیٚ بِیٚیَقَه لِیٚكِنْ بِصَبْرْ

دَرْ سَرَنْدِیبِیٚ بِاَرْدِیٚ كَتْ گِرِی
چَنْدِی سِیسَدْ سَالُ و رُوٚهْنِكْ بُونْ هَرِی

رُوْهنِكِیٚ وِی شِینْ كِرِنْ دَارُ و نَبَاتْ
چُونْ دِ اَرْضِیْدَا دُو پَا وُ مَايِ مَاتْ

پِرْ گِرِیُ و خَوشْ گِرِی بِیٚ حَدْ گَلَكْ
نَوْحَهئِیٚ (اِنَّا ظَلَمْنَا) چُو فَلَكْ

رُوْژَكِیٚ اَوْ دَرْ سُجُودِیٚ بِیٚ مَفَرْ
پِرْ گِرِیُ و هَمْ لِعَرْشِی كِرْ نَظَرْ

دِیتْ نِقِیسِی (لَا اِلَهَ اِلَّا اللّٰهْ)
بَا مُحَمَّدْ، بَا رَسُولُ اللّٰهِیٚ شَاهْ

گُوْ: "بِحَقِّیٚ آنْ مُحَمَّدْ كَیْ تَه نَقْشْ
وِی كِرِی بَا اِسْمِیٚ خَوه بَرْ سَاقِیٚ عَرْشْ

تُو بِغُفْرَانِی مِنِیٚ بِیٚ چَارَه آه"
هَاتِیٚ جَبْرَائِیلِ بَا اَمْرِیٚ اِلَه

سَرْ هِلِینَه آدَمَا! عَفْوَا جَلِیلْ
بُوْ تَه هَاتُ و رَابَه اَیْ زِیبَا، جَمِیلْ

حُـرْمَـتَـا نَـاڤِـىْ مُـحَـمَّـدْ آنْ رَسُـولْ
تَـوْبَـيَـا تَـه بُـو قَـبُـولُ و هَـرْ قَـبُـولْ

گَـرْ دِڤِـيْـتِـنْ هُـونْ ژِ نَـارِى بِـنْ نَـجَـاتْ
بِـعَـشْـقُ و شَـوْقَـكْ هُـونْ بِـبِـيْـژِنْ اَلـصَّـلاَتْ

## اِنْـتِقَالَا نُورَا پَيْغَمْبَرْ ﷺ

چُـوْنْ ژِ آدَمْ نُـورَا اَحْـمَـدْ بُـو جُـدَا
هَـاتَـه پِشْتَا (شِـيـثُ) و(بُـرْهَـانِ الْـهُـدَى)

هَـاتَـه اَصْـلاَبُ و بُـطُـونِـيْـنْ طَـاهِـرَه
قَـطْ نَـبُـو يَـكْ ژِىْ خَـرَابُ و فَـاجِـرَه

فَـوْقِـىْ (عَـدْنَـانْ) تَـا ژِ آدَمْ اِخْـتِـلَافْ
تِـىْ هَـيَـه، لَـوْ بِـىْ تِـفَـاقَـه اَوْ مَـصَـافْ

ژِيْـرِىْ (عَـدْنَـانْ) تَـا بِـ(عَبْدُ اللّٰهْ) گُـهِسْتْ
بِيسْتُ و يَـكْ بَابِنْ هَمِى رَاسْـتُ و دُرِسْـتْ

هِیْنْ بَلِی (عَـدْنَـانُ) و(مَـعْـدُ)و هَـمْ (نِـزَارْ)
(مُـضَرُ) و(اِلْـيَـاسِ)نْ بِـزَانْ اَیْ گُـوْشِـدَارْ

(مُـدْرِكَـه) پَـاشِـیْ (خُـزَيْـمَـه) تَـازَه عَيْشْ
هَـمْ (كَـنَـانَـه) پَـاشِـیْ (نَـضْـرِیْ) بُـوقُـرَيْـشْ

(مَـالِـكُ) وهَـمْ (فَهْرُ) و(غَـالِـبْ) هَـمْ (لُـؤَیْ)
(كَعْبُ) و(مُـرَّه) هَـمْ (كِـلَابُ) وهَـمْ (قُصَیْ)

هَـمْ ژِ پِشْتَا وِی (قُـصَـیِّـیْ) پَـاكُ و صَـافْ
اَوْ اَمَـانَـتْ هَـاتَـه نِـكْ (عَـبْـدُ الْـمَـنَـافْ)

هَـمْ ژِ نِـكْ (عَـبْـدُ الْـمَـنَـافْ) اَوْ مُخْتَفِی
هَـاتَـه پِـشْـتَـا (هَـاشِـمْ) اَوْ نُـورَا صَفِی

هَـمْ ژِ (هَـاشِـمْ) بُـو اَمَـانَـتْ مُـنْـقَـلِـبْ
هَـاتْ و بُـو مِيْهْڤَانِیْ (عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِـبْ)

سِـلْـسِـلَا وِی تَـا بِـآدَم دَاوُ بَـابْ
پِیْكْڤَه دِیْ بِـچْـنَـه بُهُشْتِیْ بِـیْ حِـسَـابْ

گَــرْ دِڤِـيْـتِـنْ هُــونْ ژِ نَــارى بِــنْ نَـجَـاتْ
بِـعَـشْقُ و شَـوْقَـكْ هُـونْ بِـبِـيْـژِنْ اَلـصَّـلاَتْ

## وِلاَدَتَا عَبْدُاللّٰهْ بَاڤِیّ پَیْغَمْبَرْ ﷺ

هَــمْ ژِ عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِـبْ بُـو حَـامِـلَـه
فَــاطِـمَــه هَــمْ مُــدَّتَــش بُـو كَـامِـلَـه

ژِیّ بُـو عَـبْـدُ الـلَّــهْ بِـحُـكْـمِیّ سَـابِـقَـه
نُــورِیّ اَحْـمَــدْ دَرْ (جَـبِـيـنَـشْ) بَـارِقَـه

مُـظْـهِـرِیّ نُــورَا مُـحَـمَّـدْ هَــاتِ اَوْ
پَــاكُ و نُـورَانِــى (مُـئَـيَّـدْ) هَــاتِ اَوْ

جُـبَّـهِئِیّ يَـحْـيَـى دِ شَـامِـيْـدَا نُـمُـونْ
صُـوفَـكَـه سْـپِـى بُـو هَـمِـى تِـيْـكْـدَا بِـخُـونْ

گِــرْتِ خُـونِیّ جُـبَّـئِیّ يَـحْـيَـا چُـو نَـارْ
وِیّ دَمَــا بُـويَــه شَـهِـيـدِ پِـيْـشِـوَارْ

هِشْكِ بُو آوْ خُونِ بُوْرِينْ رُوْژگَارْ
تَا وُجُودَا عَبْدُ اللّٰهِىٚ نَامِدَارْ

تَازَه بُو آوْ خُونُ و مَرْجَانْ بُونَه رِيْزْ
رَاهِبَانْ گُوْ: آيِ وَاىْ اَخْبَارِ نِيْزْ!

وَقْتَه رَابِتْ اَحْمَدِىٚ عَالِى عَلَمْ
نَاسِخِىٚ تَوْرَاتُ و اِنْجِيلُ و صَنَمْ

هَاتْ خُدَانِىٚ سَيْفُ و فُرْقَانَا مُبِينْ
خُونِىٚ يَحْيَا بُو نِيشَانَا وِى يَقِينْ

لِيْكْ ڤَگِيْرَانْ هَمْ سُؤَالُ و هَمْ جَوَابْ
وَاىِ وَيْلاَ كَفْتَه نَاڤْ اَهْلِىٚ كِتَابْ

وَانْ يَقِينْ كِرْ عَبْدُ اللّٰهْ هَاتَه وُجُودْ
بَا عَدَاوَتْ قَصْدْ كِرِنْ قَتْلاَ وِى زُودْ

اَهْلِىٚ كِذْبُ و اَهْلِىٚ زُورُ و اِفْتِرَا
چَنْدِ جَارْ آوْ هَاتِنَه (اُمُّ الْقُرٰى)

عَبْدُ اللّٰهْ دَرْ حِفْظِیْ سُلْطَانِیْ وَدُودْ
نُورَا اَحْمَدْ دَافِعِیْ شَرِیْ یَهُودْ

عَبْدُ اللّٰهْ مَازِنْ بُو بَا نَازْ و دَلَالْ
جَانِیْ عَبْدُ الْمُطَّلِبْ اَوْ مَاهُ و سَالْ

خَوشْدِقِیْ بَابِیْ، عَزِیزِیْ مَادَرِیْ
رُوْهْنِیَا مَالِیْ وُ زِیبَا، اَسْمَرِیْ

شِكْلُ و سِیمَا مِثْلِیْ بَدْرَا آسِمَانْ
نَازِكُ و رَعْنَا وُ نُورَا خَانَەدَانْ

دِلْبَرُ و مَحْبُوبُ و شِیْرِینْ وَكْ شَكَرْ
هَرْكَسِیْ اَوْ دِیتْ و دِلْ لِیْ بُو دُوكَرْ

دُوْهْتِیْ چَاكَانِیْ قُرَیْشِیُ و عَرَبْ
مُنْتَظِرْ بُونْ پِیْكْڤَه بُوْ وِی رُوْژْ و شَبْ

هَرْ یَكِیْ هِیْڤِی دِكِرْ اَوْ بِتْ قَبُولْ
بَا یَكِیْ وِی قَطْ نَدَا مَیْلَا وُصُولْ

بُو دِ آزا اَوْ ژِ فِكْرَا اِينُ و آنْ
يُمْنِى نُورَا اَحْمَدِى بُو پَاسِپَانْ

رُوژَكِى وِى گُوتَه بَابِى: اَىْ اَمِيرْ
سَاعَتَا اَزْ بِچْمَه بَطْحَايَا بَشِيرْ

مِنْ ژِ پِشْتِى تِيْتَه دَرْ، نُورَكْ مَزِنْ
رَادِبِيتَه سَرْ سَرِى مِنْ اَوْ ژِ مِنْ

اَزْ دِبِينِمْ مُنْقَسِمْ بُويَه، دُوكَر
يَكْ دِ شَرْقِى يَكْ دِ غَرْبِى چُويَه دَرْ

تِيْتَه چِسْپَانُ و چَاپِكْ بِى دَرَنْگ
تِيْتَه سَر يَكْ مِثْلِى عَوْرِى تَازَه‌رَنْگ

اَزْ دِبِينِمْ آسِمَانِى بُويَه شَقْ
رَادِبِتْ اَوْ نُورَه تَا هَفْتَمْ طَبَقْ

تِيْتَه فِى الْحَالْ دَرْ آنْ عَالِى مَقَامْ
اَزْ دِبِينِمْ تِيْتَه پِشْتَا مِنْ تَمَامْ

سَـاعَـتَـا رُونِــمْ لِـسَـرْ مَـهْـدَا زَمِـيـنْ
مِــنْ عَـجَـائِـبْ تِـيْـنَـه پِـيْـشْ و آفَـرِيـنْ

هَـمْ زِ اَرْدِيْ تِيْتَه سَـمْـعِـمْ اَقْ كَـلاَمْ:
"وِيْ دِگَـلْ تَـه نُـورَا اَحْـمَـدْ" (اَلـسَّـلاَمْ)

هَـرْچِـى دَارَا هِـشْـكَـه اَزْ بِـچْـمَـه بِنِى
بُـو هَـشِـيـنْ و كَـاتَـه اَزْ پَـلْـگَـانْ غَنِى

بُـو سِـهْ و سِـيـوَانْ لِـسَـرْ مِـنْ نَـاگَـهَـانْ
اَزْ كُو چُـومْ بُو هِشْكْ و بِيْ پَلْگْ و غُصَانْ

اَقْ چِـه رَمْـزْ و حَـالَـه؟ بَـابُـوْ بِـيْـژَه مِـنْ!
گُـوْتِـيْ بَـابِـيْ: "رُوْهْـنِـيَـا چَـاقِـيْ دِ مِـنْ

شَـابَـه مِـزْگِـيـنِـمْ لِـتَـه اَيْ نَـازَنِـيـنْ
دِيْ زِ تَـه ظَـاهِـرْ بِـتِـنْ شَـاهِـيْ اَمِـيـنْ

هِـيْـقِـيَـا مِــنْ وَاتِــقَــه دِيْ رَابِـتِــنْ
اَكْــرَمِــيْ عَــالَـمْ زِ تَـه پَـيْـدَا بِـتِـنْ

اَشْـرَفِـىٛ مَـخْـلُـوقُ و سُـلْـطَـانِـىٛ جِـهَـانْ
دِىٛ ژِ تَـه پَـيْـدَا بِـتِـنْ بِـىٛ شَـكْ بِـزَانْ

مِـنْ دِيَـه دَرْ خَـوابُ و مَـايِـمْ مُنتَظَرْ
اَحْـمَـدْ (اَزْ) پِشْـتَـا تَـه يَـه جَـانِـىٛ پَـدَرْ"

گَـرْ دِقِـيْـتِـنْ هُـونْ ژِ نَـارِى بِـنْ نَـجَـاتْ
بِـعَـشْـقُ و شَـوْقَـكْ هُـونْ بِـبِـيْـژِنْ اَلـصَّـلَاتْ

## پَيْمَانَا جُهُويَانْ آ ژِ بُوٚ كُشْتِنَا عَبْدُاللهْ

چُـوٚنْ كِـى عَـبْـدُالـلَّـهِ رَابُـو پَـاكِ ذَاتْ
خَـوشْ لِـقَـتْـلَا وِى جُـهُـودَانْ كِـرْ خَـبَـاتْ

رَاهِـبُ و اَحْـبَـارُ و هَـمْ اَهْـلِـىٛ كِـتَـابْ
ژْ آگِـرِىٛ كَـرْبِـىٛ هَـمِـى بُـونَـه كَـبَـابْ

هَـايِـدَانْ هَفْتِىٛ جُـهُـودْ (اَزْ) مُلْكِىٛ شَـامْ
تَـازَه بَـيْـعَـتْ بَـسْـتُ و عَـهْـدَا نَـاتَـمَـامْ

جَنْگێ و مَرْدِێ دِلَاوَرْ شِیرَەگِیرْ
پێکْڤَە خوارِنْ سُۆنْدُ و بَسْتِنْ تِیرُ و شِیرْ

تَا نَئِیێتَە کُشْتِنْ اَوْ زِیبَا خَرَامْ
یَكْ ژِ مَە نَائِیێتَە آخْ و مُلْکِێ شَامْ

رَاهِێ صَحْرَا گِرْتُ و چُونْ اَوْ کِینَەدُۆزْ
مِثْلِێ کُنْدِێ هَرْ بِشَقْ چُو، نِێ بِرُۆزْ

زُو گَهِشْتِنْ چُونَە دُۆرَا مَکَّهِێ
کَتْنَە بُوسَانْ مِثْلِێ آقَا بِنْ کَهِێ

دَا بِنِێ کَنْگِی دِبِینِنْ دَرْ قَە تِێ
نُۆبَدَارْ کَتْنَە کَنَارِێ هِێشْتِێ

رُۆژَکِێ وَانْ دِی بِچُۆلِێدَا مَشِی
طَالِبِێ نِێچِیرُ و آهُو وُ خَوشِی

وَانْ کُو دِی رَابُۆرِی عَبْدُللَّە چُونَانْ
بَا تَنِێ تَنْهَا بِچُۆلِێدَا رَوَانْ

فُرْصَتَا خَوه دِينْ و رَابُونْ شِيرْ هَسُونْ
چُونْ دِ پَيْدَا مِثْلِێ گُرْگِێ دَقْبِخُونْ

هَمْ دِ وِێ رُوْژِێ لِصَيْدِێ بُو وَهَبْ
يَغْنِی بَابِێ آمِنَه عَالِی نَسَبْ

چُوْنْ صَدَا هَاتْ و وَهَبْ لِێ كِرْ نَظَرْ
هَاتَه عَبْدُلْلَّهِ قَوْمِێ خُونْ جَگَرْ

رَقْدَه گُرْگَكْ هَاتَه بَرْخِێ نُوجِوَانْ
لِێ بَلِێ هِشْيَارَه لِێ زِيبَاشِقَانْ

نَاگَهَانْ فَكْرِی وَهَبْ دِی ژْ آسِمَانْ
هَاتَه خَوارِێ لَشْكَرِێ رُوحَانِيَانْ

غَيْبِيَانِێ كَسْكِپُوْشِێ گُلْعِذَارْ
هَاتِنِێ ژِيْكْرَاكِرِنْ اَوْ تَارُومَارْ

(طُرْفَةُ الْعَيْنِ) جُهُودْ بَرْ بَا كِرِنْ
وَانْ ژْ اَقَالِيمِێ جِهَانْ وَنْدَا كِرِنْ

سَـاعَـتَـا سِـــرَّا ژِ غَـيْـبِـێ دِی وَهَـــبْ
مَـــاىِ حَـــيْـــرَانُ و ڤَـــمَـــاىِ دَرْ عَـجَـبْ

چُـوْنْ ژِ عَـبْـدُلـلَّـهِ دِيـتْ اَڤْ سِـرُّ و حَـالْ
خَـوشْ لِـلَـوْحِـێ دِلْ نِقِيسِی اَڤْ خَـيَـالْ:

"گَـرْ قَـبُـولْ كَـتْ دَايَـــه وِی مِـنْ آمِـنَـه"
پَـــاكُ و مَـعْـصُـومَـه حَـبِـيـبَـه مُـقِـنَـه

گَـرْ دِقِـيْـتِـنْ هُـونْ ژِ نَـــارِی بِـنْ نَـجَـاتْ
بِـعَـشْـقُ و شَـوْقَـكْ هُـونْ بِـبِـيْـژِنْ اَلـصَّـلَاتْ

## زَوَاجَا عَبْدُللهُ و آمِنَهيێ

پَـاشِـی وِێ سِـــرَّا عَـظِـيمُ و نُـــورِ تَـابْ
نَـــازِلِـێ قَـلْـبِـێ وَهَـــبْ بُـو اِضْـطِـرَابْ

چَـاپِـكُ و چِـسْـپَـانْ ڤَـگَـرْيَـا هَـاتَـه مَـالْ
وِی حِـكَـايَـتْ كِـرْ ژِ بُـوْ مَـالَا خَـوه حَـالْ

هِـنْ حِـكَـايَـتْ كِـرْ ژِ بُـوْ زَوْجِـىٚ، وَهَـبْ
هَـمْ كَـرَامَـتْ هَـمْ ژِ جَـنْـگَا (بِـالْـعَـجَـبْ)

گُـوْتَـه زَوْجِـىٚ: "قَـنْـجَـه قَـاصِـدْ بِـى ژِ مِـنْ
رَابِـى بِـچْـيَـه خَـانَـدَانَـا دِلْ مَـزِنْ

بِـيْـژَه عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِـبْ: مِـنْ آمِـنَـه
وِىٚ لِـنِـكْ زِيـبَـا عَـفِـيـفَـه مُـقِـنَـه

گَـرْ ژِ عَـبْـدُ الـلَّـهْ بِـبِـيـتِـنْ اَوْ قَـبُـولْ
تَمْشِيَتْ دِىٚ بِيتُ و چِيْبِتْ اَوْ وُصُـولْ

نَـازِكُ و سِـيـمَـاخُـوشُ و دِلْـبَـرْ اَوَه
لَائِـقَـا وِى بَـابَـتَـا وِى هَـرْ اَوَه"

هَـاتُ و عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِـبْ كِـرْ بَـاخَـبَـرْ
هَـمْ دِ عَـبْـدُ الـلَّـهِ حُـبِّـىٚ كِـرْ اَثَـرْ

گُـوْتَـه دَايِـىٚ!: "رَابَـه اَىْ زِيـبَـاخِـصَـالْ
زَوْجَـهٖـىٚ بُـوْ مِـنْ بِـخَـوازَه بَـسْ دَلَالْ

بَاجَمَالُ و بَاكَمَالُ و بَااَدَبْ
خَوشْ اَدَا، شِێرِينْ لِقَا، عَالِیٚ‌نَسَبْ"

زُو دِرَابُو فَاطِمَه دِلْ شَادِمَانْ
نَاظِرِێ بَرْ صُورَتِێ گُلْ چِهْرَه‌كَان

پِرْ شَپَالُ و گُلْرُخَانُ و تَازَه‌عَيْشْ
سَاكِنَانِێ پَرْدَه‌ئِێ آلِێ قُرَيْشْ

دِلْ نَوَازُ و پِێكْڤَه نَازُ و قَنْدِلَبْ
كَسْ نَدِی شِێرِينْتِرْ (اَزْ) بِنْتَا وَهَبْ

آمِنَه گُلْ بُو دِ گُلْزَارِێ جَمَالْ
حُسْنِ بِێ حَدْ، قَدُّ و قَامَتْ اِعْتِدَالْ

دِێ چِه بِێژِمْ (اَزْ) جَمَالُ و مَعْرِفَتْ
وَالِدَا اَحْمَدْ، بَسَه هَرْ اَڤْ صِفَتْ

فَاطِمَه دِيتُ و ڤَگَرْيَا ضَامِنَه
گۆتَه عَبْدُلْلَّهِی بَحْتَا آمِنَه

مِثْلِێ وِێ نَابِنْ شَپَالُ و نَازَنِینْ
نِێ دِ دُنیِێ نِێ دِ فِرْدَوْسَا بَرِینْ

جَارِ دِی چُو دِیتُ و اَوْ نَازِكْ نِهَالْ
لِێقَخُورَه بَابَتِنْ هَرْدُو هَڤَالْ

هَاتَه عَبْدُ الْمُطَّلِبْ رَاكِرْ ژِ مَالْ
چُونْ ژِ بَابِێ خَوسْتِنْ اَوْ رَعْنَا شَپَالْ

وَقْیَكَه زِیڤُ و وَقِیَّكْ هَمْ ذَهَبْ
سَدْ شُتُرْ سَدْ پَزْ اَوِی دَانَه وَهَبْ

سَدْ بَقَرْ جُمْلَه جُوَانُ و سَامِنَه
بُو هِنَارِنْ پِێكْڤَه نَخْتِێ آمِنَه

هَاتِ عَبْدُ الْمُطَّلِبْ وِێ سَاعَتِێ
كِرْ تَدَارِكْ كَارُ و بَارِێ دَاوَتِێ

چِێكِرِنْ زَادُ و طَعَامِێ (بِالْعَجَبْ)
هَمْ قُرَیْشِی خَونْدِنُ و هِنْدِی عَرَبْ

آمِـنَـه خَـمْـلِـی ژِ رَنْـگِـیْ گُـلْـشَـنِـیْ
زَنْـــدُ و بَـــازِنْ رِشْـتِـنَـه ژْ رَنْـگِـیْ خَـنِـیْ

خَـوشْـنَـوَاوُ خَـــوشْ آدَا هَـــاتِـنْ عَـرَبْ
جُـمْـعَـه بُـو اَوْ شَـفْ نَـهِـیْ مَـاهَـا رَجَـبْ

وِیْ شَـڤِـیْ آنِـــی نِـــكَـاحُ و عَـقْـدِبَـسْـتْ
بُـــوكُ و زَاڤَـــا مَـــانُ و شَـرْبَـتْ دَانَـــه دَسْـتْ

دَرْ مَـكَـه مَـشـهُـورِ بُـــو اَڤْ گُـوْتِـنَـه:
"عَـبْـدُلـلَّـهْ زَاڤَـــايَـــه، بُـوكَـه آمِـنَـه"

حَـسْـرَتُ و كَـرْبِـیْ هَـمِـی بَـرْ بَـا كِـرِنْ
وِیْ شَـڤِـیْ وَانْ گُـوْ دُوسَـــدْ زِنْ ژِیْ مِـرِنْ

بُـــوكُ و زَاڤَـــا هَـــرْدُو چُـونَـه خَـلْـوَتِـیْ
شَـاهِـیَـانَـه كَـفْـتَـه بَـاغِـیْ جَـنَّـتِـیْ

زُو دِ رِضْـوَانِـــی ڤَـكِـرْ بَـابِـیْ جِـنَـانْ
دَاكَـــتِـــنْ دَرْگَـــاهِـیْ نِـیـرَانْ نَـاگَـهَـانْ

حُورُ و غِلْمَانُ و چَمُ و طَيْرُ و نَبَاتْ
هَاتِنَه حَمْدُ و ثَنَائِىٚ خوش لُغَاتْ

(اَزْ) دَمِىٚ جَانْ بَخْشِى، جِبْرِيلِىٚ اَمِينْ
مُژْدَه دَا اَهْلِىٚ سَمَوَاتُ و زَمِينْ

جَبْرَائِيلَا! هَاتِ دَوْرَا اَحْمَدِى
هَاتِ شَاهِىٚ مِثْلِىٚ وِى چَاقَانْ نَدِى

رَابَه مِزْگِينِىٚ بِبَه ژْ مَخْلُوقِرَا
ژْ آسِمَانُ و اَرْضُ و تَا (تَحْتَ الثَّرَى)

غُلْغُلَه پَيْدَا بُو دَرْ هَفْتْ آسِمَانْ
صَوْتِىٚ تَسْبِيحَا مَلَكْ چُو (لَامَكَانْ)

هَاتَه خَوارِىٚ جَبْرَئِيلُ و مُژْدَه دَا
كَسْكِ آلَايَكْ لِبَانِىٚ كَعْبَه دَا

مُژْدَه دَا مَخْلُوقَهَايِىٚ بَحْرُ و بَرْ
جُمْلَه حَيْوَانَاتِ زَانِى اَوْ خَبَرْ

خَوشْ نِدَا هَاتْ (اَزْ) يَسَارُ و مَيْمَنَه
نُورَا اَحْمَدْ هَاتُ و چُو نِكْ آمِنَه

هَاتِ نُورَانِى (شَفِيعُ الْمُذْنِبِينْ)
هَاتِ (خَيْرُ النَّاسِ خَتْمُ الْمُرْسَلِينْ)

وِىٚ شَقِىٚ هِنْدِى صَنَمْ بُونْ سَرْنِگُونْ
تَخْتِىٚ اِبْلِيسِىٚ لَعِينْ بُو وَاژِگُونْ

لَوْ لِسَرْ صُورَتْ رَقِى تَشْبِيهِىٚ مَارْ
هَاتَه كُوْهِىٚ (بُوقُبَيْسُ) وِكِرْ هَوَارْ

ذُرْيَتَا وِى جُمْلَه هَاتِنْ بِىٚ نَوَا:
"اَوْ چِه حَالَه بِيْژَه مَه؟" وِى گُوْتَه وَا:

"لَوْ لِمِنْ چِيْبُويَه تِرْسُ و زَلْزَلَه
بَا مُحَمَّدْ آمِنَه بُو حَامِلَه

هَاتِ دَوْرَا اَحْمَدِى دَوْرَا مَه چُو
لَاتُ و عُزَّا دِىٚ بِكَتْ بِىٚ آقِرُو

يَــكْ ژِ مَــه اِيــدِى نَـشِـيـتِـنْ بِـتْ عَـيَـانْ
وِى لِـمَـه رِىٚ گِــرْتْ ژِ چُـونَـا آسِـمَـانْ

هَــاتِ خُـونـرِيٚـزِىٚ جِـهَـانْـگِـيـرِىٚ سَـفَـاكْ
اَمْ ژِ دَسْـتِـىٚ وِى هَـمِـى دِىٚ بِـنْ هَـلَاكْ

رُوٚهْـنِـيَـا هَــرْدُو جِــهَـانُ و مِـلَّـتَـانْ
اُمَّـــتَـــا وِى چِـيٚـتِـرِيـنِـىٚ اُمَّـــتَـــانْ

دِىٚ چِـه بِـتْ حَـالِـىٚ مَـه وُ تَدْبِيرُ و رَاىْ؟
آىُ و وَاىُ و آىُ و وَاىُ و آىُ و وَاىْ!"

هَــمْ دِ صُـبْـحَـا وِىٚ شَـقَـا دَوْلَــتْ فُـزُون
تَـخْـتِـىٚ شَـاهَـانِـىٚ جِـهَـانْ بُـو سَـرْنُـگُـون

بِـىٚ تَـكَـلُّـمْ مَـا، دَقِـىٚ هِـنْـدِى مُـلُـوكْ
شَـاهْ اَگَــرْ حَـاكِـمْ اَگَــرْ مِـيـرِىٚ بُـلُـوكْ

گَــرْ دِقِـيٚـتِـنْ هُـونْ ژِ نَـارِى بِـنْ نَـجَـاتْ
بِـعَـشْـقُ و شَـوْقَـكْ هُـونْ بِـبِـيٚـژِنْ اَلـصَّـلَاتْ

# وَاقِعَاتِێ مُدَتِێ حَمْلِێ آمِنەیێ

آمِنِێ گُۆ تَا کِی شَشْ مَهْ چُونَه سَرْ
مِنْ ژِ حَمْلِێ خَوه نَدی قَطْ یَكْ اَثَرْ

پَاشِی شَشْ مَهْ گُۆتَه مِنْ آوَازِێ غَیْبْ:
"مِنْ لِتَه مِزْگِینَه اَیْ پَاکِیزَه جَیْبْ!

وِێ دِگَلْ تَه خَاتَمِێ پَیْغَمْبَرَانْ
نَاسِخِێ حَرْفَا کِتَابُ و دَفْتَرَانْ"

لِێ دِ خَوْنِیْدَا مَه دِیتِنْ بِێ عَدَدْ
اَنْبِیَاءُ و رَمْزُ و نِیشَانُ و سَنَدْ

اَوَلَا مِنْ دِی ژِ مِنْ نُورَك دِچِی
قَصْرِێ بُصْرَی مِنْ ژِ عَکْسَا وِێ دِدِی

مَاهِێ اَوَّلْ هَاتِ آدَمْ طَیِّبَا
کِرْ سَلَامْ و گُۆتَه حَمْلِێ: مَرْحَبَا!

مَـاهِـیٚ ثَـانِـی هَـــاتِ شِـیـثْ (اَزْ) مَیْمَنَه
گُـوْتَـه مِـــنْ مِـزْگِـیـنْ لِـتَـه اَیْ آمِـنَـه

مَـاهِـیٚ ثَـالِـثْ هَـــاتِ اِدْرِیـــسِـیٚ نَبِـی
کِـرْ سَـــلاَمْ و مُـــزْدَه بَـرْ حَـمْـلِـیٚ تَـه بِی

مَـاهِـیٚ رَابِـعْ نُـوحُ و خَـامِـسْ هُـودُ و هَـمْ
هَـاتِـنُ و مِـزْگِـینِـی دَا مِـــنْ (اَزْ)کَـــرَمْ

مَـاهِـیٚ سَـــادِسْ هَـــاتِ اِبْـرَاهِـیـمْ خَلِیلْ
دَا مَـه مِـزْگِـینِـی ژِ وِی حَـمْـلِـیٚ جَلِیلْ

مَـاهِـیٚ سَـابِـعْ هَـــاتِ اِسْـمَـاعِـیـلْ ذَبِـیـحْ
مُـــزْدَه بَخْشِی مِـنْ، ژِ وِی حَمْلِیٚ مَلِیحْ

مَـاهِـیٚ ثَـامِـنْ هَـــاتِ مُـوسَـی بَـاوَفَـا
(اِبْـشِـرِی یَـا آمِـنَـه بِـالْـمُـصْـطَـفَـی)

مَـاهِـیٚ تَـاسِـعْ هَـــاتِ عِـیـسَـی ژْ آسِـمَـانْ
مُـــزْدَه دَا مِـنْ: هَـــاتِ سُـلْـطَـانِیٚ جِـهَـانْ

اَوْ كُـو چُـو شَـشْ مَـهْ ژِ حَمْلِي مُنْقَلِبْ
گُـوْتَـه عَـبْـدُ الـلَّـهِ، عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِبْ

"بَـا تِـجَـارَتْ دِیٚ بِـچِـی تَـا سَـمْـتِیٚ شَـامْ
(اَزْ) مَـدِيـنَـه بَـازْ بِـكِـی تَـمْـرُ و طَـعَـامْ

وِیٚ دَمَـــا دِیٚ آمِـــنَـه كُـــوْدَكْ بِـبِـی
يَـــكْ ضِـيَـافَـتْ لاَزِمَـــه دَاوَتْ بِـبِـی"

عَـبْـدُ الـلَّـهْ آنْ مَـــاهِرُويِـــیٚ گُـلْـعِـذَارْ
دَرْ مَـدِيـنَـه شَـرْبَـتَـا مَـرْگِـیٚ ڨَـخَـوارْ

عُـمـرِیٚ عَـبْـدُ الـلَّـهِ بِـيـسْـتُ و پَـنْـجِ سَـالْ
بُـــوْرِیٚ، وِكِـــرْ وِی ژِ دُنْـيَـا اِرْتِـحَـالْ

زَانِـــی عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِبْ اَوْ وَاقِـعَـه
هَـــرْدُو چَـاڨِـیٚ آمِـنَـه بُـونْ دَامِـعَـه:

"اَسْـمَـرِیٚ مِـنْ مَـاوُ خَـلْـقِـیٚ كَـــارِوَانْ
هَـاتِـنُ و پَـيْـدَا، نَـه اَوْ رُوحُ و رَوَانْ

کَانْ حَبیبیٚ مِنْ! دِلیٚ مِنْ بُو دُونِیمْ
آهْ و حَسْرَتْ کۆدَکیٚ مِنْ مَا یَتِیمْ"

دَارُ و بَرْ بُۆ وِیٚ گِرِینْ وِیٚ سَاعَتِیٚ
آفُ و رُۆهْنِكْ نَادَنِیٚ قَطْ مُهْلَتِیٚ

هَمْ مَلَكْ رَابُونُ و گُۆتِنْ: "یَا کَرِیمْ
نِیٚ حَبِیبِیٚ تَه مُحَمَّدْ مَا یَتِیمْ!"

(مَالِكُ الْمُلْكِ)یٚ مَزِنْ دَا آفْ جَوَابْ:
"چِیٚتِرِمْ بُۆ وِی ژِ خِیٚرَا دَاۆُ بَابْ"

آیْ خُدَاوَنْدَانِیٚ عَقْلِیٚ مُسْتَقِیمْ
کَسْ نِزَانِتْ قِیمَتَا دُرَّا یَتِیمْ

گَرْ دِڤِیٚتِنْ هُونْ ژِ نَارِی بِنْ نَجَاتْ
بِعَشْقُ و شَوْقَكْ هُونْ بِبِیٚژِنْ اَلصَّلَاتْ

# هَاتِنَا وَخْتِیٚ وِلَادَتَا مُحَمَّدْ ﷺ

(اَزْ) رَبِیعُ الْاَوَّلَا شَفْ رَوْشَنَه
هَشْتِ شَفْ بُوْرِینْ لِحَمْلِیٚ آمِنَه

یَا نَهِیٚ زَائِلْ بُو ژِیٚ تِرْسُ و عِنَا
یَا دَهِیٚ بُو مُژْدَه دَرْ خِیفُ و مِنَی

یَازْدَهَمْ بُو غُلْغُلُ و آوَازِ هَمْ
زَمْزَمُ و تَسْبِیحِ دَرْ هِنْدِی حَرَمْ

دُوازْدَهَمْ هَلْبُو شَمَالَا دَوْلَتِیٚ
آمِنَه مَابُو تَنِیٚ دَرْ خَلْوَتِیٚ

وِیٚ شَفِیٚ دَرْ کَعْبَه عَبْدُ الْمُطَّلِبْ
مَابُو، بُوْ تَعْمِیرِیٚ اَرْضِیٚ مُنْقَلِبْ

آمِنِیٚ گُوْ: "مَامْ تَنِیٚ بِیٚ مِیْرُ و ژِنْ
اَزْ دَمَكْ تِرْسَامُ و لَرْزِی هَاتَه مِنْ

مِنْ دِی خَانِی رُوْهْنِی بێ غَایَتْ بَلِیْ
چَارِ ژِنْ هَاتِنْ ژِ رُكْنِێ مَنْزَلِێ

بَا جَمَالُ و حُسْنُ و نُورَانِیْ قَمَرْ
حُلَّهئِێ اِسْتَبْرَقُ و سُنْدُسْ دِ بَرْ

لَعْلَهَا، تِیْرْآقُ و آقَا كَوْثَرِێ
زُلْفَهَا، سَدْ طَعْنَه دَانَه عَنْبَرِێ

بَژْنُ و بَالَا سَرْوُ و سِیمَائِێ شَفَافْ
مِنْ شِبَانْدِنْ تُخْمَهئِێ عَبْدُ الْمَنَافْ

یَكْ لِدَشْتِێ رَاسْتِێ هَاتُ و یَكْ لِچَپْ
یَكْ لِپِشْتِێ، یَكْ لِپِێشِمْ بَاأَدَبْ

اَوْ كِی بُونْ؟: حَوَاءُ و سَارَه، آسِیَه
یَا لِپِێشِمْ مَرْیَمَا عِمْرَانِیَه

مَرْیَمِێ حُسْنُ و مَلَاحَتْ زِیْدَه بُو
پَالْقَدَایِی وِێ، ژِ بُوْ مِنْ تَكْیَه بُو

نَـاگَـهَـانْ بُـو زَمْـزَمْ و تَـسْبِـيحْ و دَنْـگ
بَـالُـغَـتْـهَـايِـێ مُـخَـالِـفْ رَنْـگَـهرَنْـگ

رَاسْـتْ و چَپْ مِنْ دِی کَوَاکِبْ تِێكْ فِرِینْ
قَـافِ تَـا قَـافِ جِـهَـانْ بُـو اَنْـوَرِیـنْ

پِێکْڤَه دُنْـیَـا مِـنْ دِی بُـو یَـكْ قُرْصِـێ نُـورْ
مَـشْـرِقُ و مَـغْـرِبْ دِدِیـتِـنْ مِـنْ ژِ دُورْ

کَـسْـكِ آلَایَــكْ دِ مَـغْـرِبْـدَا مَـه دِی
یَــكْ لِـشَـرقِـێ یَـكْ لِـبَـانِـێ کَـعْـبَـه دِی

اَمْــرِێ جَـبْـرَائِـیـلْ کِــرِی مِـیـرِێ مَـزِنْ
مُــژْدَه دَا اَهْـلِـێ سَـمَـاوَاتَـانْ ژِ بِـنْ

دَاکَـتِـنْ دَرْگَـاهِـێ نِـیـرَانْ نَـاگَـهَـانْ
شَـاهِـیَـانَـه حُـورُ و رِضْـوَانِـێ جِـنَـانْ

غُـلْـغُـلِـیـنْ حُـورِی دِ قَـصْـرِێ جَـنَّـتِـێ
کِـی دِزَانِــتْ کَـارُ و بَــارِێ قُـدْرَتِـێ

هَاتِ جِبْرِيلْ و مَلَائِكْ فَوْجِ فَوْجْ
چَارْكَنَارِێ مَكَّهێ بُونْ مَوْجِ مَوْجْ

نَاگَهَانْ اَزْ تِێهْنِ بُومْ وِێ سَاعَتِێ
مِنْ دِی دَا دَسْتِێ مَه تَاسَكْ شَرْبَتِێ

سِپِّی وَكْ شِيرِی، وُ شِێرِينْ وَكْ عَسَلْ
نِێ ژِ وِێ، شِيرُ و عَسَلْ بُونَه مَثَلْ

مِنْ ڤَخَوارُ و تِيْهْنِی چُو حَالِی ژِ مِنْ
طَيْرَكِی سْپِی هَاتُ و پَرْ مَالِی دِ مِنْ

وِێ دَمِێ مِنْ بُو مُحَمَّدْ مُصْطَفَی
نُورِێ جَانُ و مَعْدَنَا صِدْقُ و صَفَا

گَرْ دِڤِێتِنْ هُونْ ژِ نَارِی بِنْ نَجَاتْ
بِعَشْقُ و شَوْقَكْ هُونْ بِبِێژِنْ: (اَلصَّلَاةْ)

# گَازِیَا ذَرَّه‌یَانْ دِ دَمَا وَلِدِینَا مُحَمَّدْ ﷺ[1]

جُمْلَه ذَرَّاتێ جِهَانْ دَا اَڤْ صَدَا
کِرْنَه گَازِی پێکْڤَه گُوتِنْ مَرْحَبَا

مَرْحَبَا اَیْ سِرِّێ فُرْقَانْ مَرْحَبَا*
مَرْحَبَا دَرْمَانێ دَرْدَانْ مَرْحَبَا*

مَرْحَبَا اَیْ جَانێ بَاقِی مَرْحَبَا
مَرْحَبَا عُشَّاقێ سَاقِی مَرْحَبَا

مَرْحَبَا اَیْ عَالِی سُلْطَانْ مَرْحَبَا
مَرْحَبَا اَیْ کَانێ عِرْفَانْ مَرْحَبَا

مَرْحَبَا اَیْ شَمْسێ تَابَانْ مَرْحَبَا*
مَرْحَبَا اَیْ جَانێ جَانَانْ مَرْحَبَا*

---

١ اَڤْ بَشَا مَرْحَبَایێ، دِ دَسْتْخَطَا سَالَا (١٢٤٠) هِجْرِی‌دَا، بَسْ نَهْ مَالِكْ تێدَا هَنَه. ڤێجَا ژِبُو کُو اَوْ مَالِکێنْ کُو پَاشێ لِێ زێدَه بُوییِ بێتَه دِبَازْکِرِنْ، مِنْ لِبَرْ هَرْ بَکَه ژِ وَانْ سِتێرْکَكْ دَانِی. لێ دِ دَسْتْخَطَا اَحْمَدْ کُرێ حَسَنْ‌دَا یَا سَالَا (١٢٧١) هِجْرِی، دِ نَاڤبَرَا مَالِکَا (وێ دَمێ مِنْ بُو مُحَمَّدْ مُصْطَفَی) حَتَا مَالِکَا (سَجْدَه بِرْ هَرْ وێ دَمێ آنْ نُورێ جَانْ) تِشْتَكْ تُونَه‌یَه؛ یَانِی بَشَا مَرْحَبَایێ تێدَه تُونَه‌یَه. چَاپێنْ کُو پَاشێ وَشِیَانَه ژِی، ژِخُوه دِ ڤێ بَشێ‌دَا یَكْ یَکێ نَاکِرَه. لَوْمَا تێ ڤێنْمِکِرِنْ کُو گَلَكْ بێتْ، پَاشێ لِڤێ بَشَا مَرْحَبَایێ زێدَه بُونَه.

مَـرْحَـبَـا اَیْ قُـرَّةُ الْـعَـیْـنِـیْ خَـلِـیـلْ
مَـرْحَـبَـا اَیْ خَـاصِ مَـحْـبُـوبِـیْ جَلِیلْ

مَـرْحَـبَـا اَیْ (رَحْـمَـةً لِـلْـعَـالَـمِـیـنْ)
مَـرْحَـبَـا هَـاتِـی (شَـفِـیـعُ الْـمُـذْنِـبِـیـنْ)

مَـرْحَـبَـا اَیْ آفِـتَـابِـیْ بِـیْ زَوَالْ*
مَـرْحَـبَـا اَیْ مَـاهِـتَـابِـیْ (لَا یَـزَالْ)*

مَـرْحَـبَـا اَیْ بُـلـبُـلِـیْ بَـاغِـیْ وِصَـالْ*
مَـرْحَـبَـا اَیْ آشِـنَـایِـیْ (ذُو الْـجَـلَالْ)*

مَـرْحَـبَـا اَیْ نُـورِیْ خُـرْشِـیـدِیْ خُـدَا*
مَـرْحَـبَـا اَیْ تُـو زِ حَـقْ نَـابِـی جُـدَا*

مَـرْحَـبَـا مَـطْـلُـوبِیْ عَـالَـمْ هَـرْ تُـوِی*
مَـرْحَـبَـا اَوْلَادِیْ هَـاشِـمْ هَـرْ تُـوِی*

مَـرْحَـبَـا اَیْ نُـورِیْ حَـقـرَا مَـظْـهَـرِی*
مَـرْحَـبَـا اَیْ اَوْلِـیَـارَا سَـرْوَرِی*

مَـرْحَـبَـا هَـاتِـى شِـڤَـانِـێ اُمَّـتِـێ*
مَـرْحَـبَـا هَـاتْ بُـوٚ مَـه نُـورَا دَوْلَـتِـێ*

مَـرْحَـبَـا اَىْ بَـدْرِێ عَـالَـمْ يَـا مُـنِـيرْ*
مَـرْحَـبَـا خَـلْـقِـێ كَـتِـيـرَا دَسْـتَـه ڰِـيـرْ*

مَـرْحَـبَـا سُـلْـطَـانِـێ جُـمْـلَـه اَنْـبِـيَـا*
مَـرْحَـبَـا اَىْ نُـورِێ چَـشْـمِـێ اَصْـفِـيَـا*

مَـرْحَـبَـا اَىْ اِفْـتِـخَـارِێ اَنْـبِـيَـا
مَـرْحَـبَـا اَىْ شَـمْـعِـێ جَـمْـعِـێ اَوْلِـيَـا

مَـرْحَـبَـا اَىْ مَـنْـبَـعِـێ عِـزُّ و وَفَـا
مَـرْحَـبَـا اَىْ كَـانِـێ اِحْـسَـانُ و عَـطَـا

مَـرْحَـبَـا هَـاتِـى شَـفِـيـعِـێ اِنْـسُ و جَـانْ
مَـرْحَـبَـا هَـاتِـى لَـطِـيـفِـێ اِنْـسُ و جَـانْ

گَـرْ دِڤِـێـتِـنْ هُـونْ ژِ نَـارِى بِـنْ نَـجَـاتْ*
بِعَشْقُ و شَـوْقَـكْ هُـونْ بِبێژِنْ اَلـصَّـلَاتْ*

# مُعْجِزَەیێنْ کُو دِ شَڤَا
# وِلادَتَا مُحَمَّدْدَا ﷺ چێبُونَه

سَجْدَه بِرْ هَرْ وِیٚ دَمیٚ آنْ نُورِیٚ جَانْ
دَسْتْ هِلینَانْدِی بِسُویِیٚ آسِمَانْ

پَارَەیَكْ عَوْرِیٚ سِپِی (اَزْ) آسِمَانْ
هَاتُ و هِلْگِرْتُ و ژِ مِنْ غَائِبْ بُو آنْ

هَاتَقَه مَدْهُونُ و پێچَایِی، کَحِیلْ
پَارَه عَوْرَكْ دِی گَهیشْتِیٚ اَوْ جَمِیلْ

گِرْتُ و بِرْ، لِیٚ هَاتَه گُهْ مِنْ اَڤْ خَبَرْ:
"گِرْتِ وِی دُنْیَا سَرَاسَرْ بَحْرُ و بَرْ"

هَاتَقَه سْپِی پَارَەاَزْمِیشَكْ دِگَلْ
وِی مِژِی بَالَغْلِیٚ وَكْ شَهْدُ و عَسَلْ

لِیٚ بَلِیٚ خوشْ هَاتَه گُهْ مِنْ اَڤْ نِدَا:
"پێكْڤَه زَانِی خَلْقَهَایِیٚ اَنْبِیَا"

مِنْ دِی خَانِی بُو ژِ طَیْرَانْ رَنْگَەرَنْگْ
دُمْ ژِ زِمُرُوتَانْ و هَمْ یَاقُوتَه چَنْگْ

پَاشِێ هَاتِنْ سِێ نَفَرْ لِێ هَرْ یَکِێ
حُسْنِێ صُورَتْ مِثْلِێ قُرْصَا رُوْژَکِێ

وَانْ یَکِی دَرْ دَسْتْ مِسِینُ و یِێکِی طَشْتْ
یِێکِی آنِی جَامَەئِێ سْپِی (اَزْ) بَهَشْتْ

هَفْتِ جَارَانْ شُوشْتُ و پِێچَا پِڕْ خَبَرْ
گُوْتِنِێ، وُ هَرْ سِێ رَابُونْ چُونَه دَرْ

نَائِێتَه حَدُّ و حِسَابَانْ مُعْجِزَاتْ
مُخْتَصَرْ مِنْ گُوْتِنَه نَعْتُ و صِفَاتْ

دِێ چِه بِێژِمْ نَعْتِێ ذَاتِێ اَنْوَرِی
اِێ کُو عَالَمْ جُمْلَه بُوْ وِی چێکِرِی

مُنْعَکِسْ بُونْ وِێ شَقِێ هِنْدِی صَنَمْ
آگِرِێ فَارِسْ قَمِرْیَا چُو عَدَمْ

تَــــازَه‌اَيْــــوَانْ خَــانَــه‌ئِــىٛ نُــوشِــيــرَوَانْ
رَاسْـــتُ و چَــپْ هَــژْيَـا وُ لَــرْزِى نَـاگَـهَانْ

شَــقْ بُــو كُنْگِرْ چَــارِدَه ژِىٛ چُــونَـه خَــوارْ
خَــوْفُ و تِــرْسَــكْ هَــاتَــه كِــسْـرَا بِــىٛ قَــرَارْ

بَــحْـرِىٛ سَــاوَه چِــكْ بُــو وُ هِــشْـكُ و نِــهَـانْ
وَادِيَـــا نَـــاقْ لِــىٛ سَــمَـــاوَه بُــو رَوَانْ

(اَزْ) سَــرِىٛ هِــنْـدِى مُـلُـوكَـانْ تَـــاجِ كَـتْ
زِيّـــدَه بُــو لِــىٛ تِــرْسُ و خُــوْفُ و زَلْــزَلَـتْ

دَرْ دُوشَــنْـبَـه دُوازْدَئِـــــىٛ اَوَّلْ رَبِــيـعْ
سَــالِـىٛ فِـيـلِـى هَـــاتِ اَوْ حَـمْـلِـىٛ بَـدِيـعْ

گَــرْ دِقِـيّـتِـنْ هُــونْ ژِ نَـــارِى بِــنْ نَـجَـاتْ
بِـعَـشْـقُ و شَــوْقَــكْ هُــونْ بِـبِـيّـژِنْ اَلـصَّــلَاتْ

# نیشَانِێن کُو عَبْدُ الْمُطَّلِبی دِ دَمَا وِلَادَتَا پێغَمْبَرْدَا دِیتِنَه

رَابُو عَبْدُ الْمُطَّلِبْ تِێكِلْ سَحَرْ
گُوْ: مَه دِی زَمْزَمْ کَتَه رُکْنِێ حَجَرْ

کَعْبَه چُو سَجْدِێ مُبَارَك بُو مَقَامْ
رُکْنُ و بَانُ و بَیْتِێ لِێكْدُو كِرْ سَلَامْ

رُکْنَهَا (اَللَّهُ اَکْبَرْ) ژِێ دِهَاتْ
هَاتِ مِزْگِینَا مُحَمَّد اَلصَّلَاةْ

پَاكِ بُومْ (اَزْ) لَاتُ و عُزَّا وُ صَنَمْ
هَاتْ اَبُوالْقَاسِمْ شَهِێ عَالِی عَلَمْ

رَاسْتُ و چَپْ خَوشْ هَاتِ زِیبَا اَرْغَنُونْ
نِێ مُحَمَّدْ هَاتُ و پُتْ بُونْ سَرْنُخُونْ

هَاتِنْ اِبْرِیقُ و لَگَنْ مِسْكُ و گُلَاڤْ
کَعْبَه شُوشْتِنْ مَامَه حَیْرَانْ (اَزْ) تَڤَاڤْ

اَزْ بِدَرْكَفْتِمْ ژِ بَابِێ شَيْبَه زُودْ
مِنْ صَفَاؤُ مَرْوَه دِيتِنْ دَرْ سُجُودْ

پَلْگُ و دَارُ و بَرْ ژِ فَيْضَا (لَايَمُوْتْ)
"(جَاءَنَا اَحْمَدْ رَسُولُ اللَّهْ)" دِگُوْتْ

هَاتِ آوَازَكْ: "اَيَا مَزْنِێ قُرَيْش
اَڤْ چِه تِرْسُ و لَرْزِيَه اَیْ طِيبِ عَيْشْ"

زُودِ عَبْدُالْمُطَّلِبْ خَوشْ هَاتَه مَالْ
طَيْرَكِی مَازِنْ لِبَانِی چَنْگُ و بَالْ

بِێهْنَا فِرْدَوْسِێ ژِ حُجْرَا آمِنَه
هَاتُ و دَرْ هِنْگَافْتُ و گُوْ: "يَا سَاكِنَه!"

آمِنِێ هَاتُ و اَوِی ژِێ كِرْ سَوَالْ:
"كَانِی اَوْ نُورَا دِگَلْ تَه اَیْ شَپَالْ؟"

آمِنِێ "بُو" گُوْتِێ مَوْلُودَا مَزِنْ
هَاتِفِی نَاڤِێ مُحَمَّدْ گُوْتَه مِنْ

وِىَ دِ خَلْوِيْدَا تَنَا نُورَا مُبِينْ
گَرْ دِڤِيْتِنْ تُو بِبِينِى دِىَ بِبِينْ

رَفْتِ عَبْدُ الْمُطَّلِبْ بُوْ دِيتِنِىَ
شِيرْ دِ دَشْتِىَ نَاگَهَانْ يَكْ رَهْزَنِىَ

نَعْرَئِى زَدْ هَاتَه عَبْدُ الْمُطَّلِبْ
هَيْبَتِىَ گِرْتُ و دِلِىَ وِى مُرْتَعِبْ

نَابِتِنْ دِيتِنْ حَتَا سِىَ رُوْژْ تَمَام
دَا مَلَكْ بِيْنَه طَوَافِىَ خَاصُ و عَامْ

هَاتِ عَبْدُ الْمُطَّلِبْ بِىَ خُويشِتَنْ
بِىَ تَكَلُّمْ مَايَه ازمَانُ و دِهَنْ

پَاشِىَ چَنْدِى دِيتِ اَوْ نُورِينْ صَبِى:
"رُوْهْنِيَا چَاڤِىَ دِ بَاپِيرِىَ خَوه بِى"

آمِنِىَ شِيرْ دَا دَهَانِىَ شَكَّرِينْ
تَا گَهَشْتِىَ وَقْتِىَ تَسْلِيمَا دِينْ

آمِـنِـیٚ گـُـوٚ: "مِــنْ دِ خَــوْنـیٚـدَا دِیَـه
مُـرْضِـعَـه دِیٚ بِــتْ حَـلِـیـمَـا سَـعْـدِیَـه"

گَــرْ دِقِــیْــتِــنْ هُــونْ ژِ نَــارِی بِــنْ نَـجَاتْ
بِعَشْقُ و شَــوْقَــكْ هُــونْ بِـبِـیٚـژِنْ اَلــصَّـلَاتْ

## هَاتِنَا حَلِیمَهیِیٚ بِبَالْ مَکَهیٚ
## ژِبُوٚ شِیرْدَاهِیِیٚ

مَــكِّــیَــانْ كُـــوٚدَكْ دِدَانَـــه شِــیــرِدَارْ
دَا دِ گَــرْمِــیٚــدَا نَــبِــنْ كُـــوٚدَكْ نَــزَارْ

هَــمْ قَــبِــیــلَا سَــعْــدِیَــانْ دِیــگَــرْ بُــلُــوكْ
هَــرْ دِهَــاتِــنْ تَــا مَــكَـه طَــلْــبِــیٚ بُــچُــوكْ

وِیٚ قَــبِــیــلَا سَــعْــدِیَــانْ لِــیٚ بُــو غَــلَا
مِــیٚــرُ و ژِنْ پِــیٚــكْــڤَــه ژِ بِــرْسَــانْ مُــبْــتَــلَا

گُــوٚتْ حَلِیمِیٚ: "رُوٚژَكِـــیٚ اَمْ چِـنْـدْ هَڤَالْ
بُــوٚ كِــیَــایِــیٚ چُــونَــه نَــاڤَــا یَــكْ نَــوَالْ

هَـمْ گِـيَـا ژِى تِـىٚ هَـبُـو هَـمْ آڤِـسَـارْ
مِـنْ گِـيَـا خَـوارُ و ژِ آڤِـىٚ هَـمْ ڤَـخَـوارْ

هَـمْ هَـڤَـالَانْ ژِى گِـيَـا وُ آڤِ خَـوارْ
هَـاتِ آوَازَكْ خُـدَانِـى نَـادِيَـارْ:

"هَـا نُـهَـانْ بِـچْـنَـه مَـكَـه اَىْ جُـمْـلَـه ژِنْ
دَا مُـبَـارَكْ بِـنْ ژِ مَـوْلُـودَا مَـزِنْ

خُـرَّمْ اَوْ زِيـبَـا دِيـنْ وِى بُـوٚ خَـوه بِـتْ
اِىٚ خَـوشْ اَوْ پُـسْـتَانِىٚ كُو شِيرْ ژِىٚ بِخُوتْ)"

تِـرْسِ غَـالِـبْ بُـو لِـمَـه هَـاتِـيـنَـه مَـالْ
گُـوتَـه مِـنْ حَـارِثْ: "چِـه حَالَه اَىْ هَڤَالْ؟"

مِنْ ژِ بُوٚ وِى گُوٚتْ، اَوِى گُوٚتْ: "اَىْ حَبِيبْ!
بَلْكُو اَوْ مَـوْلُـودْ ژِ بُـوٚ مَـه بِـتْ نَصِيبْ"

مِـنْ وَلَـدْ بُـو ضُـمْـرَةَ بَـارِىٚ شِـكَـمْ
قَـطْ ژِ بِـرْسَـانْ مِـنْ نِـزَانِـى دِىٚ چِـه كَـمْ

نَاگَهَانْ مِنْ دِی دِ خَوْنِێدَا یَکِی
آزْ بِرِمْ آڤِێتِمَه رُوبَارَکِی

سِپِّی وَكْ شِیرُ و شِێرِینِ شَهْدِوَازْ
ژِێ ڤَخَوه وِی گُوٚتَه مِنْ سِێ چَارِ جَازْ

آزْ ژِ خَو رَابُومَڤَه تِێرُ و تِژِی
هَرْدُو پُسْتَانِێ دِ مِنْ شِیرْ ژِێ رِژِی

صَاحِبَانْ آزْ دِیتِمُ و پِرْسِینْ دِرِێژْ
لِێكِ تَنْبِی بُو لِمِنْ بُوٚ كَسْ مَبِێژْ

یَكْ خَرِێ لَاغَرْ هَبُو لِێ پِڕْ كَسَادْ
حَارِثْ آنِی تَازَه كُرتَانْ لِێ نَهَادْ

كَارِوَانْ رَابُو بِقَصْدَا مَكَّةَ
بُومْ سِوَارُ و هَمْ لِبَرْ مِنْ ضُمْرَةَ

دُورَه دُورِێ كَارِوَانِی لَنْگُ و لُوكْ
كَرْ ژِ چُونِێ بُو وُ حَارِثْ مَا خُدُوكْ

گۆتـه مِـنْ: "دَا بْچِينَڤه بِـیْ زَحْـمَـتِـیْ"
مِـنْ گـۆتِـیْ: "نِـیْ هَـاتِ نُـورَا رَحْـمَـتِـیْ

دَا بِـچِـيـنَـه پِـێـشِ اُوجَـاغَـا قُـرَيْـشْ
بَـلْـكُـو حَـالِـیْ مَـه بِبِيـتِـنْ تَـازَه عَـيْـشْ"

مِـنْ دِى يَـكْ مَـرِدِیْ طَـوِيـلِـیْ اَنْـوَرِى
بَـا سَـرِیْ رِمْ وِى اِشَـارَتْ دَا كَـرِى:

"(يَـا حَـلِـيـمَـه اِسْـرِعِـى) مِـزْگِـيـنْ لِتَه
تُـو دَيِـيـنِـى بُـۆ مُـحَـمَّـدْ خَـوزْ بِتَـه

تِـيـزِ چُـوبُـو خَـوشْ كَـرِیْ لَاغَـرْ مَـيَـانْ
وِى بَـرَاهِـى بِـرْ ژِ هِـنْـدِى كَـارِوَانْ

اَوَّلَا مِـنْ كِـرْ لِـبَـطْـحَـائِـیْ نَـظَـرْ
چَـارْ طَـرَفْ پِـێـكْـڤَـه گِـيَـاؤُ لَالَـهتَـرْ

كَـارِوَانْ دَانِـى لْـچِـيَـايِـیْ طِـيـبعَـيْـشْ
ژِنْ هَـمِـى گَـرْيَـانْ لِاَشْـرَافِـیْ قُـرَيْـشْ"

گـوّتِ عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِـبْ خَـوش آمِـنِـیْ:
"نِـیْ دِقِـیّـتِـنْ بُـوّ مُـحَـمَّـدْ دَایِـنِـیْ"

(قَـالَ: "هَــذَا الاَمْــرُ مِـنْـهُ قَـدْ بَـدَا)
هَـاتِ گـوّشِـیْ مِـنْ ژِ هَـاتِـفْ اَڤْ نِـدَا:

(صَـفْـوَةُ الـرَّحْـمَـنُ و خَـیْـرُ الْـمُـرْسَـلِـیـنْ)
نِینَه (اَزْ) غَـیْـرِی حَلِیمَه وِی دَیِـیـنْ"

هَـاتِـنَـه نِـكْ آمِـنَـه ژِنْ بَـاسُـرُوزْ
هَـرْ چِـی زَانِـی اَوْ یَـتِـیـمَـه چُـو قَـدُوزْ

اِیْـخَـوشْ اَوْ زِیـبَـا یَـتِـیـمِـی شِـیـرِخَـوزْ
هَـرْ دُو عَـالَـمْ ژِیْـرِفَـرْمَـانْ سَـرْ بِـسَـرْ

اِیْـخَـوشْ اَوْ رَعْـنَـا یَـتِـیـمِـی شِـیـرِجُـو
نُـورِیْ هَـرْدُو عَـالَـمْ (اَزْ) رُخْـسَـارِیْ (اُو)

اَیْ حَـلِـیـمَـه هِـلْـگِـرَه (آنْ) پَـاكِ ذَاتْ
دَوْلَـتَـا بَـاقِـیْ و دَائِـمْ بُـوّ تَـه هَـاتْ

هَــاتْ حَـلِـيـمَـه گُـۆتَـه عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِـبْ:
حَـالِـێ سَـــالُ و حَــالِـێ قَـحْـطَـا مُـضْـطَـرِبْ

هَـاتِـمَــه بُـۆ يَــكْ پِـسَـرْ اَزْ بِــمْ دَيِــنْ
گَــرْ لِـنِـكْ تَــه دِێ هَـبِـى (نِـعْـمَ الْاَمِــيـنْ)

گُـۆتِـێ عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِـبْ: نَـامِـيْتْ چِـيَـه؟
گُــۆتِــێ: نَــاقِــێ مِـــنْ حَـلِـيـمَـا سَـعْـدِيَـه

گُـۆتِێ عَبْدُ الْمُطَّلِب): "خَـوش مَهْدِى تُو
هَـمْ بِـحُـسْـنُ و هَـمْ بِـحِـلْـمُ و سَـعْـدِى تُو

وِێ لِنِكْ مِـنْ نُـورِێ چَشْمُ و قُوتِێ جَـانْ
مِـثْـلِـێ وِى نَــێ بُـونَـه نَـابِـنْ دَرْ زَمَـــانْ

لِـــێ يَـتِـيـمَــه دُرَّه بِـــێ مِـثْـلَـه، مَـهَـێ
اَزْ لِـجِـێ بَـابِـێ مَـه گَـرْ دِێ تُــو بِـبَـێ"

گُـۆتَـه عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِـبْ: "دَا اَزْ بِـچَـمْ
بِـێـژِمَـه زَوْجِــێ خَــوه پِـرْسِـێ ژِێ بِـكَـمْ"

هَـاتِ گُـۆتَـه حَـارِثْ اَوْ زِيـبَـا خِـطَـابْ
(يَـاحَـلِـيمَـه وَيْـحَـكِ!) وِى دَا جَـوَابْ

دِێ چـه کَـێْ تُـو بَـايَـتِـيمِـێ بِـێ پَـدَرْ
مَـا حَـلِـيمَـه دَامَـنَـا صَـبْـرِێ دُوکَـرْ

هَـاتَـه چُـونِـێ کَـارِوَانِـى، کِـرْ جِـهِـێزْ
دِيـتِ حَـارِثْ رُۆهْـنِـکِـێ وِێ بُـونَـه رِێـزْ

گُـۆتِـێ حَـارِثْ: "اَزْ دِبِـينِـمْ تُـو خُـدُوكْ"
گُـۆتِـێ: "حَـقَّـه! دِێ بِـچِـمْ اَزْ بِـێ بِـچُـوكْ"

گُـۆتِـێ: "هَـرْ بِـينَـه اَوِى طِـفْـلِـێ يَتِيمْ
(قَـدْ تَـوَكَّـلْـنَـا عَـلَـى الـلَّـهِ الْـكَـرِيـمْ)"

خَـوشْ ڤَـگَـرْيَـا پِـێشِ عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِـبْ:
"هَـاتِـمَـه دُرْدَانَـهئِـێ تَـه اَىْ مُـحِـبْ!

دَا بِـچِـينَـه پِـێشِ دَانَـايِـێ اَمِـينْ
مِـنْ کُـو دِى اَوْ حُـسْنُ و دِيـنْـدَارَا شِرِينْ

يَــكْ رَگَــمْ خَــالِــی نَـمَــا (اَزْ) مُحْبَتِیٚ
بُــومَــه يَــخْسِــيرَا وِی اَزْ وِیٚ سَـاعَـتِــیٚ

خَــوشْ مَــه هِـلْـگِــرْتُ و كَنِی اَوْ نِــیٚ گَلَكْ
نُـــورِیٚ خَــنْــدِیٚ لَاحِــقِــیٚ چَــرْخَــا فَـلَـكْ

بُــوسَــه دَا مِــنْ چَــاقُ، وپُــسْتَـانِــیٚ يَمِينْ
خَــوشْ مِــژِی بَــا هَـــرْدُو لِيٚقِیٚ شَــكَّــرِيــنْ

رَاسْـــتْ قَــخَــوارُ و دَقْ نَــدَا ثَــدْيَــا چِپِیٚ
هِــشْــتَــه بُــوٚ ضُــمْــرَه بِــالْـهَــامَــا خُــدِیٚ

وَقْــتِــیٚ چُــونِــیٚ هَـــاتِ عَــبْــدُ الْـمُــطَّــلِبْ
دَا مَــه زَادُ و تِــشْــتُ و مِــنْ گُــوٚ: يَــا مُحِبْ

مِــنْ بَــسَــه اَقْ كُــوٚدَكِــیٚ نُــورِيــنْ جَــمَــالْ
دَوْلَــمَــنْــدِمْ دِیٚ چِــه كَــمْ بَــا تِــشْــتُ و مَــالْ

خَــوشْــتِ خَــاطِــرْ مِــنْ زِ جَــدٌّ و آمِــنَــه
آمِــنِـــیٚ هِــلْــگِــرْتُ اَوْ نَـــازِكْ تَــنَــه

دَابُو بَرْ بِيْهْنَا خَوه رُوْهْنِكْ بُونَه چَمْ:
اَیْ مُحَمَّدْ دِیْ بِچِی اَزْ دِیْ چِه کَم؟

دُورِیَا تَه سُوْهْتِ قَلْبِیْ آمِنَه
لِیْ چِه کَم اَفْ شُوْلَه نَه بْدَسْتِیْ مِنَه

اَیْ حَبِیبِیْ مِنْ مُحَمَّدْ بَسْ دَلَالْ
بِیْژَه دَا رُوْهْنِكْ نَبَارِنْ بُوْ تَه آلْ

تُو بِکَه فَرْوَارِ دَا صَبْرُ و سُکُونْ
بُوْ مَه بِیْتِنْ وَرْ نَه، جَانُ و دِلْ مَه چُونْ

تو اَمَانَتِیْ خُدِیْ بِی، اَیْ جِگَرْ!
اَیْ حَلِیمَه (فِی اَمَانِ اللَّهْ) بِبَرْ"

وِیْ حَلِیمِیْ بُوْ خَوه بِرْ دُرَّا یَتِیمْ
اِیْ خَوشْ اَوْ دَایِینَهئِیْ سَعْدُ و حَلِیمْ

* * *

صُبْحِیْ رَابُو کَارِوَانِیْ سَعْدِیَانْ
اَوْ کَرِیْ لَاغَرْ ژِ بُوْ وَانْ هَرْسِیَانْ

حَارِثْ آنِێ و حَلِیمَه بُو سُوَارْ
پَاخِلَا رَاسْتِێ مُحَمَّدْ تِێ قَشَازْ

یَا چَپِێ دَانِیبُو تِێدَا ضُمْرَتَه
کَرْ سِقِكْ چُو چَاپُكْ و بِێ زَحْمَتَه

اَوَّلَا چُو کَعْبَه سِێ جَارْ سَجْدَه بِرْ
(ثَانِیَا) اَوْ هَاتَه چُونِێ پِرْ هُنَرْ

دِێ کُسَانْ اَوْ کَرْ نَبِی چُونْخَوشْ، چَلَكْ
وِێ لِپِشْتَا وِی سِوَارِێ نَهْ فَلَكْ

اَوْ کَرِێ لَاغَرْ دِ پِێشِ کَارِوَانْ
وَكْ سِیَا طَیْرِێ لِدَشْتِێ بُو رَوَانْ

سَعْدِیَانْ گُوٚتَه حَلِیمَه: "اَیْ هَقَالْ
اَوْ کَرِێ لَاغَرْ مَه گُوٚ نَاچِیتَه مَالْ

قِێ دَمِێ سِێ لِێ سِوَارِنْ مِثْلِێ طَیْرْ
وِێ دِچِیتِنْ نَاگِهِێ وِی کَسْ بِسَیْرْ"

کَـرْ بِـاَزْمَـانْ هَـاتُ و گُـوْتَـه سَـعْـدِيَـانْ:
"قَـطْ عَـجَـائِـبْ نِـينَـه چُـونَـا مِـنْ عَـيَـانْ

وىٚ لِـپِـشْـتَـا مِـنْ رَسُـولِـىٚ رَبِّـىٚ عَـرْشْ
ژێـرِدَسْـتِـىٚ وِى ژِ عَـرْشِـى تَـا بِـفَـرْشْ

سَـيِّـدِىٚ مَـخْـلُـوقِـىٚ (رَبِّ الْـعَـالَـمِـينْ)
چِـێـتِـرِينِـىٚ اَوَّلِـيـنُ و آخِـرِيـنْ"

قَـوْمِـىٚ سَـعْـدِى پِێكْڤَه گُـوْتِـنْ اَڤْ مَـقَـالْ:
"نِـينَـه اَڤْ قَـوْلُ و صَـدَا (اِلَّا خَـيَـالْ)"

مِـثْـلِـىٚ بَـابِـىٚ كَـفْـتَـه رِىٚ ؤُ هَـرْ بِـغَـارْ
دَانَـه سَـر يَـكْ كُـوْهُ و دَشْـتُ و كُـوْهِـسَـارْ

گُـوْتِ اَزْمَـانِـىٚ حَـلِـيمَـه اَڤْ بَـيَـانْ:
"اَمْ بِـدُورْكَـفْـتِـنْ ژِ خَـلـقِـىٚ كَـارِوَانْ

مِـنْ دِى سَـاكِـنْ اَرْبَـعُـونِـىٚ رَاهِـبَـا
تَـابِـعِـىٚ اُسْـقُـوفَـكِـىٚ اَسْـوَدْ قَـبَـا

وِی دِگُـوْتَـه رَاهِـبَـانْ وَصْـفِـیْ حَـبِـیبْ:
وَقْـتَـه رَابِـیـتِـنْ مُـحَـمَّـدْ (عَـنْ قَـرِیـبْ)

کَـاسِـرِیْ اَصْـنَـامُ و قَـتَّـالِـیْ جُـهُـوْدْ
بِـیْ عَـدَدْ نِـیشَـانِـیْ وِی هَـاتْـنَـه وُجُـوْدْ

اَزْ ژِ وَانْ بُـوْرِیـمُ و چَـنْـدِی نِـیْ گَـلَـكْ
شُـعْـلَـهئِـیْ نُـورَا مُـحَـمَّـدْ چُـو فَـلَـكْ

وَیْ هَـــوَارَه! گُـوْتِ اُسْـقُـوفِـیْ کَـبِـیرْ
هَـیْ اَقَـه وَرْنِـیْ و ژِیْـکْـرَا کِـنْ بِشِیرْ

دَشْـتِ دَا شِـیـرَانُ و هَـاتِـنْ شُبْهِیْ صَانْ
خَـوشْ لِـپَـیْ مَـه مُـلْـحِـدَانِـیْ بِـیْ اَمَـانْ

دِیْ چِـه کَـم یَـا رَبْ مَـدَدْ مِـیرِیْ مَـزِنْ
وَا مُـحَـمَّـدْ رُوْهْـنِـیَـا چَـاڤِـیْ دِ مِـنْ

هَـاتِ نِـیْـزِیـکِـی مَـه کُـوْمَـا رَاهِـبَـانْ
مِـنْ مُـحَـمَّـدْ دِی نَـظَـرْ دَا آسِـمَـانْ

هَـاتـه خَـوارِیْ آگِـرِیْ مِـثْلِـیْ شِـهَـابْ
تِـیْ وَرَاتْ و سُـوْتِـنْ اَوْ اَهْـلِـیْ عَـذَابْ

هَـاتِـفِـی گُـوْفـتَـا ژِ یُـمْـنَـا شَـهْـسِـوَارْ:
"(اُهْـلِـكَ الْـكُـفَّـارُ مِـنْ نَـارِ الْـجَـبَّـارْ)"

کَـــارِوَانْ هَـــاتُ و هَـمِـی اَمْ چُـونَـه مَـالْ
پِیْکْفَه پِـیْ خَـوش بُـونْ نِـسَـاءُ و هَـمْ رِجَـالْ

گَـرْ دِقِـیْـتِـنْ هُـونْ ژِ نَـارِی بِـنْ نَـجَـاتْ
بِعَشْقُ و شَـوْقَـكْ هُـونْ بِـبِـیْژِنْ اَلـصَّـلاَتْ

## دِ نَاڤْ قَبِيلَهيَا سَعْدِيَانْدَا
## وَاقِعَهيِيْنْ كُو ژِ پَيْغَمْبَرْ چِيْبُونَه

دَوْلَـتَـا بَـاقِـی گَـهَـا نَـاڤْ سَـعْـدِیَـانْ
رِزْقُ و نِـعْـمَـتْ هَـاتُ و نَـابِـنْ طَخْلِیَانْ

دَخْـلُ و دَانُ و گَـا وُ پَـزْ لِـیْ زِیْـدَه بُـونْ
هَـمْ جَـفَـا وُ مِـحْـنَـتُ و آلاَمِ چُـونْ

پێکْڤه هَـاتِـنْ دَسْـتُ و پـێ لِـێ بُوسَه دَانْ
مُـحْـبَـتَـا وِی کَـفْـتَـه قَـلْـبِـێ جُـمْـلَـهکَـانْ

هَــمْ حَـلِـیمَـه غَـرْقِـێ اِنْــعَــامُ و کَــرَمْ
وِێ اَبُــوالْـقَـاسِـمْ لِـمَـالِـێ، بُـۆ چِـه غَـم!

گُــۆتِ: (وَالــلَّــهِ الْـعَـظِـیـمْ) اَڤْ نَــازِدَارْ
هَــاتُ و مِــنْ جَامَه نَشُشْتِنْ قَـطْ چُـو جَارْ

طَــاهِـرُ و پَـاکِـیـزُ و پَـاقِـژْ هَــرْ مَــه دِی
(بَــوْلُ و غَــائِـطْ) مِثْلِێ عَــوْرَتْ مِـنْ نَـدِی

بُـو دُو سَــالِـێ و خِــرَامَــانْ سُــو بِـسُـو
تِـێـکِـلِـی لَـعْـبَـا بِـچُـوکَـانْ قَـــطْ نَـبُـو

رُۆژَکَـــا وِی، هَـفْـتِـیَـا یَــكْ کُـۆدَکِـی
هَـفْـتِـیَـا وِی مَــاهُ، و مَــهْ بَـا سَـالَـکِـی

اَوَّلِـــێ لَــفْــظَــا وِی مَــایَــه مِــنْ لِـبِـیرْ
گُــۆتِ وِی: (اَلــلَّــهُ اَکْـبَـرْ مِــنْ کَـبِـیرْ)

سَالِێ سِێ نَازِكْ نِهَالِێ رُوحِێ جَانْ
آرَزُو كِرْ وِى شِقَانِى نَاگَهَانْ

هِنْ بِحُكْمِێ كَارِێ اُمَّتْ پَرْوَرِى
بُو شِقَانِێ لَائِقِێ پَيْغَمْبَرِى

رُوْژَكِێ وِى گُوْتِ: اَىْ مَادَرْ! بِرَا
كَانِێ؟ وِمِنْ گُوْتِێ: پَزْ بِرْيَه چَرَا؟

گُوْتِ: قَطْ اِنْصَافَه دَايِێ! اَزْ لِمَالْ
اَوْ لِگَرْمِێ اَزْ قَخُومْ آقَا زَلَالْ

گُوْتَه مِنْ وِى: اَزْ دِتِرْسِمْ حَاسِدِى
بِيْتُ و تَه چَاقِينْ بِكَتْ يَا رَاصِدِى

گُوْتَه مِنْ: دَايِێ مَه بِسْپِيْرَه خُدِێ
مِنْ تَوَكُّلْ دَايَه وِى، تُو مِنْ بِدِێ

صُبْحِێ مِنْ دَايِێ عَصَا وُ زَادِ هَمْ
بُو شِقَانْ و هَرْدُو چُونَه بَرْ غَنَمْ

اَیْ شِـــڤَــانِـــیٚ بَـــرَّئِـــیٚ بِـــرْجَـــا بَـــرَه
ژِیٚـــرِگُـــوٚپَـــالِـــیٚ تَـــه عَـــالَـــمْ یَـــکْـــسَـــرَه

بَـــا تَـــرَحُّـــمْ پَـــزْ چَـرِیـــنِـــی جَـــانُ و دِلْ
رَحْـــمِـــیٚ تُـــو بَـــرْ جُـمْـلَـه عَـــالَـــمْ مُـشْـتَـمِـلْ

اَیْ شِـــڤَــانِـــیٚ کُـــوٚدَکِـــیٚ زِیـــبَـــا، دِلِـــیٚـرْ
خُـــوٚزِی وِی بَـــرْخِـــی، ژِ دِیـــنْـــدَارَا تَـــه تِیٚرْ

وَقْـــتِـــیٚ اِیٚـــڤَـــارِیٚ شِـــڤَـــانْ دِیٚ بِیٚـــتَـــه مَـــالْ
اَزْ دِچُـــومَـــه پِـــیٚـــشِ زِیـــبَـــایِـــیٚ دَلَالْ

گُـــوٚتِ دَایِـــیٚ هَـــاتْ مَـــه گُـــوٚ: هَـــاتِـــمْ (اِلَـــیْـــكْ)
اَیْ مُـــحَـــمَّـــدْ (سَـــلَّـــمَ الـــلّـــهُ عَـــلَـــیْـــكْ)

ضُمْرَه هَـــاتُ و گُـوٚتَه مِنْ اَڤْ خَـوشْجَـوَابْ:
"مِـــنْ ژِ وِی دِیـنَـــه عَـجَـائِـبْ بِـیٚ حِـسَـابْ

پَـــا نَـــهَـــدْ بَـــرْ خِـــشْـــكُ و کَـــسْـــكِ بُـــونْ تَـــمَـــامْ
هَـــرْ چِـــی اَوْ دِی دَارُ و بَـــرْ لِـــیٚ کِـــرْ سَـــلَامْ

بێژتە پرز: دێ هەرە آوْ دِێ بچی
وز: نچە، ناچیتْ و ساکِنْ مُلْتجی

رُوژکی پرز بو بلاقی وادیێ
مِنْ ڤکیراقە ژ ترسا عادیێ

گُوتە مِنْ: بُو چە تُو ناهێلی دِلێرْ!
پرز بچی. مِنْ گو: جهێ قیغانە شێرْ

(لَا تخفُوا) گُوتە مِنْ، پرز چُو چرە
ناگهانی هاتە مە اوْ قسورە

وِی مُحمّد دیتْ و دُوقێ خوە هژانْدْ
عاشقانە هاتە پیشْ و سرْ نهادْ

گِرتِ گُوشْ و گُوتِنێ یکْ دُو مثلْ
مِنْ نە فهمی وِی چە گُوتێ گرْ دِگلْ

شێرِ رابو چُو وُ ایدی کسْ ندی
پرز چرِی خوشْ راحتُ و کفْتە قدی

(آنْ) يَـكِـىْ پَـزْ مِـنْ شِكِيْنَا دَسْـتِ هِيْژْ
هَـاتَـه پِـيْشْ و وِىْ يَـدِىْ خَـوه كِـرْ دِرِيْـژْ

دَسْـتِـىْ (آنْ) پَـزْ گِـرْتُ و مَـالِـى بَـا دَلَالْ
وِىْ دَمِـــى رَابُـــو بَـــزِى مِثْلِـىْ غَـــزَالْ

وَقْـتِـىْ ظُـهْـرِىْ رُوْژَكِـــىْ بِـىْ كَـــارُ و بَـارْ
ضُمْرَه چَاپِكْ هَـاتُ و گَـازِى كِـرْ: "هَـوَارْ!

جُـوْتَــه‌مَـرْدِمِ بُـوْ مُـحَـمَّـدْ هَــاتُ و بِـرْ
اَزْ نِــزَانِــمْ بَـابِـرَايِـىْ مِــنْ چِـه كِـرْ"

وَا مُـحَـمَّـدْ گُـوْتُ و رَابُـــونْ مِـيْرُ و ژِنْ
گُـــوْتِ حَـــارِثْ: "وَا حَلِيمَه وَىْ لِـمِـنْ!

هَـاتَـه كُـشْـتِـنْ دَرْ غَـرِيـبِـىْ بَـرْگِـىْ عَيْشْ
دِىْ چِـه بِـيْـژِمْ پِـيْشِ سَـــالَارِىْ قُـرَيْــشْ!"

پِيْكْڤَه رَابُـــونْ خَـــاصُ و عَـامِـىْ سَـعْـدِيَـانْ
لِـــىْ حَـلِـيـمَـه زُو گَـهِـشْـتِـىْ آنْ زَمَـــانْ

گۆتە: "مِنْ دِی دَرْ تَبَسُّمْ لَعْلِیْ شُوزْ
ژِیْ دِچُو چَرْخَا فَلَكْ اُسْتُونِیْ نُورْ

بُوسَە دَا مِنْ هَرْدُو چَاڤِیْ سُرْمَەئِی
اَوْ چِە بُو هَاتِی حَبِیبِیْ مِنْ تُوئِی؟"

گۆتە مِنْ: "هَاتِنْ دُو مَرْدِیْ بَا جَمَالْ
شَكْلِیْ نُورَانِی، ژِ نُورَا (لَا یَزَالْ)

دَسْتِیْ مِنْ گِرْتُ و رَڤَامْ آنِیمَە هِیْزْ
دَانِیَامَە اَرْدِیْ وُ دَرْ دَسْتَە، كِیْرْ

سِینَەئِیْ مِنْ وِی دُوكَرْ كِرْ تَا بِنَاڤْ
ژِیْ دَرِینَا قَلْبُ و اَحْشَائِیْمْ تَڤَاڤْ

وِی بِدَسْتِیْ خَوە دِلِیْمْ تَقْلِیبِ كِرْ
نُقْطَەئِیْ اَسْوَدْ دَرِینَا ژِیْ ڤَكِرْ

گۆتە مِنْ: اَڤْ بَهْرَەئِیْ دِیْوِیْ لَعِینْ
مِنْ ژِ تَە آڤِیْتِ اَیْ شَاهِیْ اَمِینْ

اِیٚ دِی آنِــی یَــكْ مَسِینُ و یَــكْ لَگَنْ
شُــشْــتُ و پَــاكْ نَــرْمُ و نَــازِكْ بِـیٚ مِحَنْ

وِیٚ دَمِــیٚ دَانِـینَــه جِــهْ قَـلْـبُ و جَـگَـرْ
مُـوْهْـرَکَــه مَــازِنْ ژِ نُــورِیٚ هَـاتَـه دَرْ

مُـوْهْـرِ کِـرْ هَـمْ قَـلْـبُ و جَـایِـیٚ بُـویَـه شَـقْ
هَــاتَــه سَــرْ یَــكْ اَوْ بِـاَمـرِیٚ مِـیـرِیٚ حَـقْ

رَاکِـــرِمْ دَانِـــیـمَــه جِــهْ بِــیٚ زَحْـمَـتِـیٚ
گُــوْ: بِـکِـیْشَــه بَــا دَهَـــانْ (اَزْ) اُمَّــتِـیٚ

بَــا دَهَـــانْ کِـیْشَــانُ و اَزْ بُـومَــه گِـرَانْ
گُــوْ: بِـکِـیْشَــه بَــا هَـــزَارَانْ هَــرْ وَسَــانْ

هَــاتَــه کِـیْشَــانُ، وِمَــه رَاکِـــرْ اَوْ هَــزَارْ
گُـوْتِـیٚ وِی نُــورِیـنْ جَـبَـاهِـیٚ گُـلْـعِـذَارْ:

"گَـــرْ بِـکِـیْشِـی بَــا جَـمِـیـعِـی اُمَّــتِــیٚ
دِیٚ گِــرَانْــتِــرْ بِـیـتَــه نُــورَا رَحْـمَــتِــیٚ"

هَــرْدُوكَــانْ اَزْ دَامَــه بَــرْ بِيْهْنَا خَــوه صَافْ
هَــرْ دُو چَشْمَانْ و سَــرِىٚ مِــنْ كِــرْ طَــوَافْ

مِــثْلِــىٚ بَــرْقَــا خَــاطِــفَــه رَابُـــونُ و چُــونْ
مِــنْ دِدِيــتِــنْ تَــا دِ چَــرْخِــىٚ بَـــرْزَه بُــونْ

گُــوٚتْ حَلِيمِىٚ، اَڤْ بَــيَــانُ و اَڤْ مَــقَــالْ
مِــنْ ژِ وِى هِــلْــگِــرْتُ، وَاَمْ هَاتِينَه مَــالْ

قَــوْمِــىٚ سَــعْــدِى گُــوٚتَــه مِــنْ: "چِــه سَاكِنِى!
رَابَـــه هِــلْــگِــرْ وِى بِــبَــه نِـــكْ كَــاهِــنِــى"

مِــنْ بِــرَه نِــكْ كَــاهِــنِــى اَوْ قِــصَّــه گُــوٚتْ
كَــاهِــنِــى هِــلْــگِــرْتُ و دَا بَــرْ سِينَه گُــوٚتْ:

"(اُقْــتُــلُــوا هَـــذَا الْـــغُـــلَامَ) مِـــنْ دِگَــلْ
وَرْ نَــه، دِىٚ بَــاطِــلْ بِــكَــتْ دِيــنِــىٚ هُــبَــلْ

نَــاگَــهَــانْ مِــنْ دِى يَــكِــى مَـــرْدِىٚ مَــزِنْ
رِمْ لِــكَــاهِــنْ دَا لِــبَــاسِــىٚ وِى كَــفِــنْ

قَـوْمِـىْ كَـاهِـنْ بُـو هَـلَاكْ اَوْ ژِى هَـرِىْ
مِـنْ مُـحَـمَّـدْ آنِـىُ و هَـاتِـمْ لِـرِىْ

مِـنْ دِى يَـكْ ژِنْ بَـاگِـرِيـنُ و شِـينُ و آهْ
بَـرْ كَـنَـارِىْ بِـيرِى بَـرْ سَـرْ، خَـاكِـىْ رَاهْ:

"وِىْ لِـمِـنْ بُـو يَـكْـپِـسَـرْ بُـو جَـانِ پَـاكْ
چُـو دِ بِـيـرَانْـدَا وُ آخِـرْ بُـو هَـلَاكْ"

مِـنْ مُـحَـمَّـد آنِـىُ و مِـنْ گُـوِتِـىْ: "وَرْ
مُـعْـجِـزَه گَـرْ تَـه هَـنَـه دِىْ بِـينَـه دَرْ

وِى اِشَـــارَتْ كِـرْ بِـتِـلْـيَـا نُـورِ بَـاقْ
آقْ بِـسَـرْ كَـفْـتُ و پِـسَـرْ بَـر رُوِيِـىْ آقْ

اَوْ ژِ آقِـىْ هَـاتَـه دَرْ رَابُـو قِـيَـامْ
گُـوِتِ آنْ دَمْ: (يَـا مُـحَـمَّـدْ اَلـسَّـلَامْ)

هَـاتِ آوَازَكْ: "تَـعَـجُّـبْ نِـينَـه گَـرْ
اَوْ ژِ بِـيـرَانْ كُـوِدَكَـانْ بِـينِـيتَـه دَرْ

اَوْ تَـعَـجُّـبْ بُـو كُـو چَـاوَا شَـهْـسُـوَارْ
دِیٚ خَـلَاصْ كَـتْ ڤَـانْ گُـنَـهْـكَـارَانْ ژِ نَـارْ"

پَـاشِـیٚ اَزْ چُـومَـه سَـرِیُ و هَـرْدُو چَـاڤْ
لِـیٚ رَشَـانْـدِنْ عَـنْـبَـرُ و مِـسْـكُ و گُـلَاڤْ

هَـاتِ دَنْـگِـیٚ هَـاتِـفِـی: "يَـا مَـكَّـةَ!
اِیٚ ژِ تَـه هَـاتِـی بَـلِـیٚ وِیٚ هَـاتَـه تَـه"

كَـتْـمَـه كَـارِیٚ، وِیٚ دَمِـیٚ اَزْ دَمْ بِـدَمْ
آمِـنَـه پِـرْ ژِیٚ غَـرِيـبَـه دَا بِـبَـمْ

گَـرْ دِڤِـيٚـتِـنْ هُـونْ ژِ نَـارِی بِـنْ نَـجَـاتْ
بِـعَـشْـقُ و شَـوْقَـكْ هُـونْ بِـبِـيٚـژِنْ اَلـصَّـلَاتْ

## ڤَگَرَا حَلِيمَهيِیٚ بِبَالْ مَكَهيِیٚ ژِبُوٚ تَسْلِيمْكِرِنَا پَيْغَمْبَرْ لِآمِينَهيِیٚ

(آنْ) خَـرْ آنِـیُ و حَـلِـيـمَـه بُـو سُـوَارْ
هَـمْ لِـبَـرْ سِـينَـه حَـبِـيـبِـیٚ نَـامِـدَارْ

رُو بِكَعْبَه هَـاتُ و اَوْ بِـێ تِـرْسُ و بِيمْ
اَوْ كَـرِێ خَـوشْ چُـونْ دِبِـێـنْ هَاتَه حَطِيمْ

هـاتَـه گُـوْشِـێ (آنْ) حَـلِـيمَـه اَفْ نَـوَا
خَـوشْ نَـوَايِـێ جَـانْ فَـدَايِـێ (اَزْ) هَـوَا:

"اَیْ حَـطِـيمُ و اَیْ حَـرَمْ پَـاكُ و تَمِيزْ
هَـاتِ بُـوْ تَـه بَـرْژْنُ و بَـالَايِـێ عَـزِيـزْ

هَـاتِ سُـلْـطَـانِـێ فَـلَـكْ ژِێـرِ نِـعَـالْ
هَـاتِ جَـانَـانِـێ دُو عَـالَـمْ عَكْسِێخَالْ

هَـاتِ مَـحْـبُـوبِـێ دُوسَـدْ يُـوسِـفْ غُـلَامْ
هَـاتِ مُـخْـتَـارِێ كُـو عَـرْشُ و فَـرْشِ رَامْ

هَـاتِ بُـوْ تَـه اَیْ مَـكَـه وَقْـتِـێ سُـرُورْ
سَـدْ هَــزَارَانْ نُـورِێ سِـيمَـايِـێ بِـنُـورْ

نِـێ تُـو بُـوِيِـی مَـنْـزِلَا رُوحَـانِـيَـانْ
تَـا قِـيَـامَـتْ رُكْـبَـدَارِێ حَـاجِـيَـانْ"

رَاسْتُ و چَپْ فَكْرِى حَلِيمَه كَسْ نَدِى
وِىٚ دِ گَرْدَابَا تَحَيُّرْدَا خَوه دِى

هَرْ پَيَاپَىْ هَاتِ آوَازِىٚ شِرِينْ
مُصْطَفَى وِىٚ دَانِيَانْدَه سَرْ زَمِينْ

دَا بِچِيتِنْ طَلْبَه كَتْ كَانِى كِيَه
خَوشْ دِبِيٚژِى ڤِى نَوَايِىٚ عَالِيَه

كَسْ نَدِيتُ و هَاتَڤَه اَوْ هَادِرِى
مُصْطَفَى لِىٚ بَرْزَه بُو بَرْ دَا گِرِى

دَنْگْ هَلِينَا وِىٚ لِبَانُ و كُوٚهْ چِيَا
آهْ و وَاهْ! دُرْدَانَه‌ئِىٚ مِنْ كِىٚ رَڤَا؟

مَكّيَانْ گُوٚتِنْ: مَه هَاىْ ژِىٚ نينَه قَطْ
وِىٚ ڤَرِيٚتِنْ آڤْ و رُوٚهْنِكْ بُونَه شَطْ

پِيرَمِيٚرَكْ هَاتَه پِيٚشْ و بَاعَصَا
اَىْ حَلِيمَه اَڤْ چِه حَالَه بُوٚ خَودَا؟

مِــنْ ژِ بُــۆ وِی گُــۆتِ حَــالِــیٚ رَنْــجُ و آهْ
گُــۆتَــه مِــنْ: وَرْ دَا بِچِینَه پِیٚشِ شَاهْ

اَزْ بِـــرِمْ تَــا پِـیٚــشِ عُـــزَّایِـــیٚ صَـنَـمْ
گُــۆتَــه مِــنْ: اَڤْ غَـیْـبَــهزَانَــه پِـرْکَـرَمْ

نِــیٚ هَـــــزَارَانْ بَـــرْزَه وِی پَـیْـدَا کِـرِنْ
مِثْلِیٚ تَـه بِـیٚ چَــارَه وِی پِـرْ شَـا کِـرِنْ

سَـجْـدَه بِــرْ پِـیـرِی وُ گُــۆتِ: اَیْ صَـنَـمْ
اَڤْ حَـلِـیـمَـه هَــاتِـیَــه پِـیٚـشِـی تَــه هَـمْ

کُــۆدَکِــیٚ وِیٚ دَرْ مَــکَــه وُنْـــدَا بُــو لِـیٚ
اِسْـمِـیٚ (آنْ) کُـــۆدَکْ مُـحَـمَّـدْ بُـو بَلِیٚ

وِی، مُـحَـمَّــد گُــۆتَــه عُــزَّایِــیٚ صَـنَـمْ
سَـرْنِـشِـیـقِـی هَــاتَــه سَـجْـدِیٚ گُــۆتِ هَـمْ:

تُــو هَــرَه اَیْ پِــیـرُۆ! اَوْ چِــه گُــۆتِـنَـه
اَوْ مُـحَـمَّــدْ هَــاتُ و نِــیٚ عَــزْلَا مِـنَـه

سَرْنُخُونْ و شَرْمِسَارِينْ اَمْ ژِ وِى
هَمْ كَسَادْ و بِىْ عَيَارِينْ اَمْ ژِ وِى

اَوْ زَمَانْ چُوِيى هَوَه اَمْ خَوشْدِقِينْ
بَارِگَاهَا وِى گَهِيشْتُ و اَمْ رَقِينْ

رَابَه اَىْ پِيرِىْ هَوَائِى هَاتِ رُوژْ
بَسْ بِنَاقِىْ وِى دِلِىْ مِنْ تُو بِسُوژْ

نِىْ ژِ نَاقِىْ وِى دِلَرْزِنْ آسِمَانْ
هَمْ ژِ حُبَّا وِى كَلِينَه بَحْرُ و كَانْ

هَيْبَتِىْ خَوشْ گِرْتَه پِيرِىْ رِهْسِپِى
وِى عَصَا آقِيْتُ و لَرْزِى مِثْلِىْ بِى

لِىْ حَلِيمَه گُوتَه پِيرِىْ هِيْشَتِىْ
گَرْ چِه اَز كَفْتِيمَه بَحْرَا حِيْرَتِىْ

يَكْ دَمِىْ بَاوِى لِمِنْ وَعْظِىْ دِكَتْ
يَكْ دَمِىْ سَكْنِى بِمِنْ رَحْمِىْ دِكَتْ

كُودَكِىٚ مِنْ وِىٚ رَڤَايِى غَيْبِيَانْ
غَيْبِيَانِىٚ كَسْكَهپُوْشِىٚ آسِمَانْ

اَزْ ژِ كِىٚ نَالَمْ ژِ كِىٚ گَازِنْ بِكَمْ
هَرْ چِه اَوْ بِيّژِيتَه اَزْ دِىٚ وِىٚ بِكَم

گُوْهْتِنَا غَيْبِىٚ اِجَازَتْ مِنْ نَبُو
لَوْ دِبِيّژِمْ: اَحْمَدِىٚ مِنْ بَرْزَه بُو

گَرْ بِبِيّژِمْ حَالُ و اَسْرَارِىٚ دَرُونْ
دِىٚ بِبِيّژِنْ: دِينَه، سَوْدَايَه، جُنُونْ

گُوْتِ پِيرِى: اَىْ حَلِيمَه ڤِىٚ بِكَه
حَمْدِىٚ رَبَّانِىٚ و هَرْ شُكْرِىٚ بِكَه

(حَاشَ لِلَّهْ) اَوْ مُحَمَّدْ بَرْزَه بِى
بَلْكُو عَالَمْ دِىٚ دِ وِيدَا بَرْزَه بِى

بُوْ مُحَمَّدْ هَرْ زَمَانُ و هَرْ مَكَانْ
سَدْ هَزَارَانْ نُوْبَدَارُ و پَاسِبَانْ

زَانِــى عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِـبْ اَوْ وَاقِـعَـه
آڤ و رُوْهْـنِـكْ چُـونْ ژِ چَـاڤَـانْ دَامِـعَـه

هَـاتَـه بَـرْ دَرْگَـاهِـىٚ كَـعْـبَـه اَوْ بِـصُـوْزْ
اَىْ عَـلِـيمِـىٚ سِـرُّ و اَىْ دَانَـايِـىٚ رُوْزْ

مِـنْ دِ سِـيمَـائِـىٚ خَـوشْ اِىٚ دُرِّا يَتِيمْ
دِيـتِـنَـه آثَــارُ و اِحْـسَـانْ اَىْ كَـرِيـمْ

نَـاشِـبِـيـتَـه مَـه اَگَـرْ چِـه كُـو ژْ مَـه‌يَـه
كِـيـمِـيَـائِـىٚ فَـضْـلُ و اِحْـسَـانَـا تَـه‌يَـه

تُـو بِـحَـقِّـىٚ فَـضْـلُ و اِحْـسَـانَـا عَـظِـيمْ
بِـيْـژَه مَـه اَحْـوَالِـىٚ وِى طِـفْـلِـىٚ يَـتِـيمْ

نَـاگَـهَـانِـى هَـــاتِ آوَازِىٚ لَـطِـيـفْ
هَـا نُـهَـانْ بِـچْـنَـه تُـهَـامَـه‌ئِـىٚ شَـرِيـفْ

وِىٚ لِـبِـنْ دَارَا يَـمَـامَـه‌ئِـىٚ غَـمَـامْ
بُـويَـه سِـيْـوَانُ و دِ كَـفَّـا وِى مُـدَامْ

بَـرْ دِكَـــنْ تَـسْبِيحُ و دَرْ كَـفْ مُنْقَلِبْ
رَابُـــو زُو چُـو طَـلْـبَـه عَـبْـدُ الْـمُـطَّـلِبْ

چُـو كُـو رُونِـشْـتِـى لِـبِـنْ دَارَا يَـمَـامْ
(قَــالَ: مَــنْ اَنْـــتَ) اَيَــا شِـيْـرِيـنْ غُــلَامْ؟

گُـوْتِـىْ: اَىْ نَـامِـيْـمْ ژِ مِــنْ پـرِسِـى بِـلَـزْ
اَزْ (مُـحَـمَّـدِ بْــنِ عَـبْـدُ الـلَّــهِ)مْ اَزْ

گُـوْتِـىْ: اَزْ جَـدِّىْ تَـهمَـه اَىْ رُوحِــىْ جَانْ
اَىْ حَـبِـيـبِـىْ مِــنْ عَـزِيـزِىْ خَــانَــهدَانْ

دَابُـــو بَـرْ سِـيـنَـه سُـــوَارْ كِـرْ هَــاتَــه مَــالْ
هَــاتَــه مَــالِــىْ تَـــازَهنُـــورَا لَايَـــزَالْ

آمِـنِـىْ چَـــاڤْ بُـونَـه رَوْشَـــنْ (وَالــسَّــلَامْ)
هَــمْ ژِ مَـــوْلُـــودَا نَـبِـى (تَــمَّ الْــكَــلَامْ)

گَـرْ دِڤِـيْـتِـنْ هُــونْ ژِ نَـــارِى بِـنْ نَـجَـاتْ
بِعَـشْـقُ و شَـوْقَـكْ هُــونْ بِـبِـيْـژِنْ اَلـصَّـلَاتْ

# مُنَاجَات

اَحْمَدَا چَاڤِێ تَه (مَا زَاغَ الْبَصَرْ)
يَكْ اِشَارَاتَا تَه (اِنْشَقَّ الْقَمَرْ)

حُكمِێ تُو جَارِى ژِ عَرْشِى تَا بِفَرْش
اَیْ ژِ نُورَا تَه مُنَوَّرْ تَا بِعَرْش

آتَشِێ مُوسَا چِه بُو؟ رُخْسَارِێ تُو
(وَالضُّحىٰ) نُورَا دِلِێ هِشْيَارِێ تُو

دُرْدِێ نُورَا تَه ضِيَائِێ مِهْرُ و مَاهْ
(لِي مَعَ اللّٰهِ الْجَلِيلِ) بَارِگَاهْ

نِێ ژِ نَعْلَيْنَا تَه اَیْ دُرِّا يَتِيمْ
فَخْرُ و تَشْرِيفَه ژِ بُو عَرْشِێ عَظِيمْ

هَرْدُو عَالَمْ چِه؟ سِهَا اِقْبَالِێ تُو
سُوْنْدِێ (وَاللَّيْلِ) بِزُلْفُ و خَالِێ تُو

هَمْ تُو رُوحُ و هَمْ رَوَانِێ جَانُ و دِلْ
پِێشِ بَژْنَا تَه سِهَا تَه بُو خَجِلْ

جَانْفِدَايِێ بَژْنُ و بَالَايِێ تَه بِمْ
مَسْتُ و سَرْگَرْدَانِێ سِيمَايِێ تَه بِمْ

شَهْرِيَارِێ چَتْرَەئِێ عَوْرَايِێ تُو
خَطِّێ شَقْ بُو بَرْ فَلَكْ طُغْرَايِێ تُو

شَهْسُوَارِێ دُلْدُلِێ كَوْنُ و مَكَانْ
وَاصِلِێ وَحْدَتْ سَرَايِێ (لَامَكَانْ)

مِنْ هَبِنْ سِێسَدْ هَزَارْ اَزْمَانُ و دَڤْ
يَكْ دَمِێ غَافِلْ نَمِينِنْ رُۆژُ و شَڤْ

وَصْفِێ حُسْنَا تَه بِبِێژِمْ صُبْحُ و شَامْ
سَدْ قِيَامَتْ دِێ بِچِنْ هِێژْ نَاتَمَامْ

# دُعَــا

يَــا رَسُــولَ اللّٰـهْ رَسُـولِـىٚ اِنْــسُ و جِنْ
يَــا شَـفِـيـعِـىٚ صَـــدْرِىٚ دِيـــوَانَــا مَـــزِنْ

تُــو شَـفَـاعَـتْ كَـه ژِ بُـۆ مَـه عَـاصِـيَـانْ
وَرْ نَـه، نَـفْـسَـا شُـومَـه نَـاكَـتْ قَـنْـجِـيَـانْ

(يَــا كَـرِيـمُ و يَــا اِلٰــهَ الْـعَـالَـمِـيـنْ
يَــا رَحِــيـمُ و يَــا عَـظِـيـمُ و يَــا مَـتِـيـنْ)

هِـێـڤِـيـدَارِىٚ رَحْــمُ و اِحْـسَــانَــا تَـيِـينْ
طَـالِـبِـىٚ اِكْـــرَامُ و غُـــفْـرَانَــا تَـيِـيـنْ

حَـاضِـرُ و گُـــهْـدَارِىٚ مَـــوْلُــودَا رَسُـــولْ
هِـێـڤِـيَـا مَـه تُـو بِـكَـىْ يَــا رَبْ قَـبُـولْ

نِـىٚ تُـو غَـفَّــارِىٚ و سَـتَــارِىٚ عُـيُـوبْ
مَــا بِـبَـخْـشِـىٚ و بِـغُـفْـرَانِـىٚ ذُنُـوبْ

هَـمْ لِـدَا ۆ و بَـابِـێ هِـنْـدِی مُـؤْمِـنِـینْ
هَـمْ لِـهِـنْـدِی مُـؤْمِـنَـاتَـانْ اَجْـمَـعِـینْ

تَـابِـعِـێ آنْ شَـهْـسُـوَارِێ اُمَّـتِـێ
پِـێـكْـڤَـه رَابِـیـنْ دِێ بِـچِـینَـه جَـنَّـتِـێ

(اَوَّلاً) بُـۆ رَوْضَـهْیَـا نُـورِیـنْ نِـقَـابْ
(ثَـانِـیَـا) بُـۆ آلْ و اَزْوَاجُ و صَـحَـابْ

(ثَـالِـثَـا) بُـۆ اَنْـبِـیَـاءُ و مُـرْسَـلِـینْ
(رَابِـعَـا) بُـۆ اَوْلِـیَـاءُ و مُـؤْمِـنِـینْ

هَـمْ ژِ بُـۆ حُـجَّـاجُ و غُـزَّاتَـانْ تَـمَـامْ
هَـمْ ژِ بُـۆ ڤِـێ مَـجْـلِـسَـا صَـاحِـبْ طَـعَـامْ

هَـمْ ژِ بُـۆ هَـرْ چَـارْ اِمَـامِـێ جَـادَهْئِـێ
هَـمْ ژِ بُـۆ وِی كَـاتِـبِـێ ڤِـێ نُـسْـخَـهْئِـێ

بُـۆ جَـمِـیـعِـێ مُـؤْمِـنِـینِـێ صَـالِـحَـه
بُـۆ فَـقِـیـرِێ بَـاتَـهْئِـی (اَلْـفَـاتِـحَـه)